عبدالله ملاأحمد

# شەرحی

# ﴿عوامل ملامحسن﴾

چاپی یەکەم-2007

*ناوی کتێب: شەرحی (عوامل ملامحسن).

*ڕاڤیار:عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد.

*نەخشەسازی بەرگ:ئامانج یاسین.

*نەخشەسازی ناوەوە:وەرگێڕ.

*پیت چنین:سەنتەری کۆمپیوتەری کەڵەیم.

*چاپخانەی:چوارچرا.

*چاپی یەکەم.1428 ـ 2007.

*ژمارەی سپاردنی( 139 )ی،ساڵی(2007)ی،دراوەتێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أبدع نظام الوجود، واخترع ماهيات الأشياء بمقتضى الجود، والصلاة والسلام على فخر الورى سيدنا محمد العبود، مصباح الظلام ونبي الإسلام في البيض والسود، وعلى آله وأصحابه هداة الإسلام في الحي والجمود، عليهم سجال الرحمة إلى يوم الخلود.

وبعد: سوپاس و ستايشى خواى گەورە دەكەم، لەسەر ئەو نيعمەتانەى كە هەرگيز لە ژمارە نايەن، وە سەرى رێزو نەوازشى بۆ دادەنەوێنم كە ئەو هيوايەى باوكمى هێنايە دى، ئەويش ئولفەت گرتنى دڵى من بوو بە علومى ئيسلامى يەوە. بە ڕاستيى عيلمى (نحو) گەلێك گرنگە، ئەوەى لەم مەيدانەدا نەبێت نازانێت چەندە گرنگە، وچەند پاڵپشتێكى بەهێزە بۆ تێگەيشتن لە ماناى قورئان، هەروەك مامۆستا مەلا عبدالكريمى مدرس دەفەرموێت:

بەبێ صەرف و نەحو دەس نــــادا بۆ كەس

فامى ئەســـاسيى ديـــــــــيى موقەددەس

وە ئەم عيلمە بنەمايە بۆ تامەزرۆيانى عولومى ئيسلاميى، هەر بۆيەش زانايەكى وەك شێخ عبدالقادر عبدالعزيز لە كتێبى (الجامع في طلب العلم الشريف)دا دەفەرموێ: ئەوەى نەحو و صەرف نەزانێت فەتواى لــێ وەرناگيرێ.

جا بەندەى بەند كراويش،كە خۆى بە تامەزرۆى ئەم عيلمە دەزانێت نەك بە(بەتوانا)يەكى ئەم مەيدانە، پشت بە خوا دەستم كرد بە شەرح كردنى (عوامل ملا محسن) وە سەرچاوەى ئەم شەرحەم زياتر بريتى يە لە كتێبى (القواعد النحوية في شرح عوامل ملا محسن) هەروەها (جامع المقدمات)و(اعراب الفاظ القرآن الكريم). لە خوا دەپاڕێمەوە كە لێمى وەربگرێت و خوێنەريش لە دوعاى خێر بێ بەشم نەكات

فيا ليت الذي يقرأ كتابي دعاني بالخلاص في العذاب

خادم العلم والدين:

عبدالله ملا أحمد

7شوال 1420 : 14/ 1 / 2000

بسم الله الرحمن الرحيم

کتێبی "عوامل ملا محسن".

پێش ئەوەی کە بچینە سەرباسەکە،با پوختەیەك دەربارەی مەلا موحسین وکتێبی عەوامیلەکەی بزانین، مەلا موحسین، یەکێك بووە،لەزانا پایە بەرزەکانی سەدەی یازدەهەم،وهەلگری رێبازی شیعەی دوانزدە ئیمامی بووە،کە بە، مەلا موحسینی فەیضی کاشانی ناسراو بوو، وباوکیشی زانایەکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە،باوکی مەلاموحسین خاوەنی کتێبخانەیەکی گەورە بووە،ئەگێڕنەوە،کە کتێبخانەکەی مۆرانە تێیداوەوهەموو کتێبەکانی دارزاندووە، تەنها بەرگە رەقەی کتێبێك ماوەتەوە،کە ئەم بەیتە شیعرەی لەسەربووە.

علمی کەحقیقی أست،درسینە بود درسینە بود،هر أنچە درسی نبود.

صدخانە ترا،کتـــاب سودی نکند باید کەکتابـــخانە،در سینە بود.

ئەگەر ئەم گێڕانەوەیەش ئەصڵی نەبێت،بەڵام بەڕاستی لەتیفەیەکی جوانی تیادایە،چونکە زانستی ڕاستەقینە ئەوەیە کەلە سینگ دایە،کەبەداخەوە زاناکانی ئێستامان توشی بەلایەکی خراپ بوون،کەئەویش ئەوەیە تەنها پشت بە کتێب ئەبەستن ولەبەرکردن وزانینیان لە یاد کردووە، وبە بێ کتێب لەهەر مەسەلەیەکدا بێ ئاکام ئەمێننەوە،عەرەبیش جوانی گوتوە:"العلم فی الصدور،لافی السطور". مەلا موحسینی فەیضی کاشانی،لە ساڵی (1091)ی،هیجری،لە کاشان لەدنیادەرچووە.

أحمدك يا من يرفع إليه صالح العمل، و أصلي على نبيك محمد، وآله المبني لهم كرامة المحل.

سوپاس و ستایشت دەکەم ئەی خوایەك، کە هەموو کردەوەیەکی چاکە هەر بۆ لای تۆ بەرز دەبێتەوە.

ئیعرابەکەی: أحمد: فیعلی موتەکەللیم وەحدەیە، لە (حَمَدَ) (يَحْمَدُ) هاتووە، ئەلف: فاعیلە. ك: مەفعول بە. یا من: (یا) نداء (من) : مونادا، و لەبەر ئەوەی کە (مَن) مەعریفەیە لە مەحەلدا مەضمومە. یرفع: فیعلی موضاریعە وفاعیلەکەی "هو"یە.إلیە: جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بە(یرفع). صالح: مەفعول بە،بۆ (یرفع)وهو مضاف. العمل: موضاف إلیە.

و أصلي على نبيك محمد، وآله المبنى لهم كرامة المحل.

وە صەلاّت و درودو سەلام دەنێرم بۆ سەر پێغەمبەری تۆ، کە موحەممەدەﷺ وە لەسەر شوێنکەوتووانی، ئەوانەی کە ڕێزێکی کۆتایی نەهاتوویان بۆ هەیە.

أما بعد: النحو علم بأصول تعرف بها أحوال أواخر الكلمة اعرابا و بناء، والكلمة اسم وفعل وحرف وهي:

زانستی نەحو:ئەو زانستەیە کە بە هۆی چەند بنەماو یاساو ڕێسایەکەوە هەست بەوە دەکرێت کە کۆتایی هەر وشەیەك چ نیشانەیەکی بۆ دابنرێت، بۆ نموونە بە هۆی حەرفی جەڕەوە دەزانین کە ئیسمەکەی دوای ئەو مەجرورە، جا ئەمە لە ڕووی ئیعرابەوە، وە هەروەها لە ڕووی (بناء)یشەوە وەهایە، کە لە دوایی دا باسی دەکرێت. وە کەلیمە سێ بەشە: ئیسم، فیعل، حەرف.

أماتَعْمَلْ وتُعْمَلْ أو تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ أو تُعْمَلْ ولا تَعْمَلْ أو لا تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ.

1."تَعْمَلْ وتُعْمَلْ": کەلیمە عامیلیش دەبێت و دەبێتە "مەعمول"یش،وەك فیعلی موضاریعی "یضرب" کە عامليش دەبێت، وە دەشبێتە "مەعمول" بە هۆی حورروف جازیمە وناصیبەوە، وە یان،وەك "اسم فاعل واسم مفعول" کە دەبنە "فاعل و نائب فاعل" وە هەروەها بەهۆی حەرفی جەڕو عەوامیلی ناصیبەوە دەبنە "مەعمول".

2. "تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ": هەندێ جار کەلیمە عەمەل دەکات، کەچی نابێتە "مەعمول"، وەك حورروفی ناصیبەی "أن، لن ، کي، إذن" وە حورروفی جازیمەی وەك: "لم ،لما، لام الامر، لاءالنهي، أن الشرطية" کە ئەمانە عەمەل دەکەن و نابنە مەعمول، وەك:

"أن یضرب". کە "أن" ،"یضرب"ی مەنصوب کردووە، کەچی خۆی ناکرێتە مەعمولی شتی تر.

3. "تُعْمَلْ ولا تَعْمَلْ": هەندێ کەلیمە دەبنە مەعمول، کەچی نابنە عامیل، ئەمانەش وەك ئەسمائی موتەمەککینەی جامیدە، وەك "زید، عمرو، تقی، حسن"ئەمانە کە دەبنە مەعمول کەچی عەمەل ناکەن.

4."لا تَعْمَلْ ولا تُعْمَلْ": هەندێك کەلیمە نە دەبنە عامیل، نە دەبنە مەعمول، وەك: حورروفی عەطف، وەك: "واو، ثم، لكن،(ـــلا )ی، تعریف "وەك (الرجل)و حورروفی ئیستیفهامی وەك: (أ، هل،) کە نە دەبنە مەعمول ونە دەبنە عامیل.

والعوامل منها، تتنوع على عشرين نوعا، سماعية وقياسية، فالسماعية منها: ثلاثة عشر نوعا، والقياسية منهاسبعة أنواع،ونحن نذكرالعوامل ونشيرألى أصناف معمولاتها بعون الله تعالى وحسن توفيقه ومشيّته.

وه بزانه عه‌واميله‌كان ده‌بنه بيست جۆر، كه هه‌ندێكيان سه‌ماعين و هه‌ندێكيان قياسين.

سه‌ماعی: ئه‌وه‌يه كه قاعيده‌ی گشتی نه‌بێت، به‌ڵكو به سه‌ماعی بيسترا بێت.

قياسی: ئه‌وه‌يه كه قاعيده‌ی گشتی هه‌بێت، وه‌ك ئه‌وه‌ی كه هه‌رفيعله‌ی فاعيله‌كه‌ی مه‌رفوع ده‌كات.

سه‌ماعی يه‌كان سێزده جۆرن. وه قياسی يه‌كان حه‌وت جۆرن.

جا ئێمه لێره‌دا ئه‌و عه‌واميلانه باس ده‌كه‌ين و ئاماژه بۆ پۆلێن كردنی مه‌عموله‌كانيان ده‌كه‌ين، پشت به خوای گه‌وره‌و كۆمه‌ك به ته‌وفيق و ويستی ئه‌و.

النوع الأول: من العوامل السماعية، حروف تجر الإسم فقط، وهي على المشهور سبعة عشر حرفا، نظمتها بالفارسيّة:

باو تاو كاف و لام و واو و منذ، مذ، خلا
رب حاشا، من عدا، في عن على، حتى إلى.

وهي الظرف حكما، فلابد لها من متعلق مثله، فعلا كان أو شبهه، أو معناه فإن كان عاما، مقدرا فمستقر وإلا فلغو.

جۆری يه‌كه‌م له عه‌واميله سه‌ماعی يه‌كان ئه‌و حه‌رفانه‌ن كه ته‌نها ئيسمێك مه‌جرور ده‌كه‌ن و ناچنه سه‌ر فيعل و حه‌رف و له‌سه‌ر قه‌ولی مه‌شهور حه‌ڤده دانه‌ن: به‌م شێوازه:

باو تاو كاف و لام و واو و منذ، مذ، خلا
رب حاشا، من عدا، في عن على، حتى إلى.

بزانە هەندێ لـە نەحویەکان کە یەکێکیان ئیبن هیشامە، حەرفە جەڕەکان بە بیست دانە دادەنێن، کە باس لـە هەموویان دەکەین إن شاء الله تعالی.

وە بەصری یەکان بەم حەرفانە دەڵێن: "حروف الجر"، چونکە دەچنە سەر ئیسم و مەجروری دەکەن، کوفی یەکان بەحوروفی "اضافة" ناویان دەبەن، چونکە ئەم حەرفانە صیفەتێکی ظە رفی لـە ئیسمدا دروست دەکەن.

وە ئەم حەرفە جەڕانە وەك "ظرف" وان، واتە چۆن "ظرف" پێویستی بە "تعلق" هەیە ئەمانیش هەروەها پێویستیان پێی هەیە، کە ئەمەش هاوڕێکی گوتەی ئیبن هیشامە.

بەشەکانی موتەعەلـلیق:

1.پێویستە یان تەعەلـلوق بە فیعلەوە ببەستێت ئیتر "جامد" بێت، یان "متصرف"، وەك (عسی،کان) یان "ناقصە" یان "تامە" بێت.

2.پێویستە یان تەعەلـلوق بە "شبە فعل"ەوە، ببەستێت وەك "اسم فاعل، اسم مفعول" وەك (ضارب) کە شەبیهی (ضرب)ە، چونکە ڕوودان و "فاعل"ەکەی تێیدا ڕووی داوە. وە ئیسمی مەفعول وەك (ضُرِبَ) وەهایە، چونکە ڕوودان و"نائب فاعل"یەکەی تێدایە.

3.پێویستە یان تەعەلـلوق بە مانای فیعلەوە ببەستێت، واتە بۆنی فیعل بدات، وەك (فلأن حاتم في قومە) کە مانای "حاتم" سەخێتی دەگرێتەوە، بۆیە "فی قومە" جار ومەجرور، بە "حاتم"ەوە، تەعەلـلوق دەبەستێت.

*جیاوازیی نێوان ظه رفی (مستقر) و(لغو):

بزانە کە موتەعەللیقی ظه رف و جارومەجرور دەبێتە چوار بەش:

1. موتەعەللیق بە ئەفعالی خوصوص کە لە لەفزدا بێت.

2. موتەعەللیق بە ئەفعالی خوصوص کە مەحزوف بێت.

3. موتەعەللیق بە ئەفعالی عوموم،کە لە ڕستەکەدا هەبێت.

4. موتەعەللیق بە ئەفعالی عوموم، و مەحزوفیش بێت.

جا لەو سێ بەشەی یەکەمدا بە (ظرف لغو) ناو دەبرێت و بەشی چوارەم بە (مستقر)، کەوابوو لە (وإلا فلغو)دا سێ بەشەکەی سەرەوە دەگرێتەوە.

ئەفعالی عام یان عوموم: ئەوانەن کەلەسەر واتای (ثابت) بوون، یان "جێگیر بوون" و ئەوانە دێن.

وە بۆیە بە "ظرف لغو" ناو دەبرێن، چونکە فاعیل لە موتەعەللیقەکەدایە، چونکە لە لای عولەمای نەحو کە فاعیل لە ظه رف و جارو مەجروردا نەبووبە (لغو) ناو دەبرێت.

بە کورتی: جار ومەجرور وەك "ظرف" وایە، پێویستە تەعەللوق ببەستێت بە فیعل یان شیبە فیعل، یا "معنى فعل"، جا کە تەعەللوقی بە ئەفعالی (عام)ەوە بەست، وە ئەو فیعلانە مەحزوف بوون، ئەوە "مستقر"ی پێ دەگوترێ، ئەگەر وانەبوو "لغو"ە.

فمِنْ: لإبتداء الغاية، مكانا، نحو: "سرت من البصرة إلى الكوفة"، أو زمانا، نحو" صمت من يوم الجمعة"، أو غيرهما نحو: "قرأت من آية كذا"، وللتبيين،

نحو: قوله تعالى: ﴿فاجتنبوا الرجس من الأوثان﴾ و "عندي عشرون من الدراهم". وللظرفية: كقوله تعالى: ﴿ ماذا خلقوا من الأرض ﴾ وتكون زائدة، في غير الموجب أي المنفي، نحو" ما من إله إلا الله"، و"هل من خالق غير الله" و"لا تؤذ من أحد". بزانه كه "من" بۆ سێ جۆر دابەش دەکرێت، کە بۆ سەرەتای مەبەستە.

1.مەکانی: وەك(سرت من البصرة إلى الكوفة).کە ئیبتیدای غایە "بصرە"یە. (سر): فیعلی ماضییە، کە لە ئەصڵدا (سار، سیر)یە. (ت): فاعیلە. (من) حەرفی جەڕە. (البصرە): ئیسمی مەجرورەو موتەعەللیقە بە "سرت"ولە مەحەلدا مەنصوبە، وە مەفعولی بە واسطە یە بۆ "سرت".مەبەست لێرەدا "من"ە، کە بۆ "ابتدای غایە"ی مەکانی بەکارهێنراوە.

2.زەمانی: وەك (صمت من يوم الجمعة). (صمت): فیعل وفاعیلە. لە (صام، یصوم)ەوە هاتووە. (من یوم): جارو مەجرورەو،لە مەحەلدا مەنصوبە، وە مەفعولی بە واسطە یە بۆ (صمت)، وهو مضاف. (الجمعة): مضاف إليه. مەبەست لێرەدا "من"ە کە بۆ "ابتدای غایە"ی زەمانی بەکارهێنراوە.

3.پەیوەست نەبێت نە بە زەمان و نە بەمەکان، وەك: (قرأت من آية كذا). (قرأت): فیعل وفاعیلە. لە (قرأ، یقرأ) هاتووە، (من آية): جارو مەجرورەو موتەعەللیقە بە (قرآن). (کذا): لە ئەسمائی (کنایە)یە،و لە مەحەللی نەصبدا مەفعول بە،یە، بۆ "قرآن".وە "من" بۆ "تبیین"یش، واتە ڕوون کردنەوە بەکاردێت، وەك: ﴿فاجتنبوا الرجس من الأوثان﴾ وە هەروەها (عندی عشرون من الدراهم) نموونەی دووەمی (تبیین)ە، کە (عندی) ظەرفە و (یاء): موتەکەللیم وَحْدَهُ، موتەعەللیقە بە (استقر) و خەبەرەو پێشکەوتوە.

(عشرون): موبتەدايەودواكەوتوە. (من الدراهم): جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بە عامیلێكی موقەددەرە، ولەمەحەلدا مەنصوبە. مەبەست لێرەدا (من)ە، كە بۆ (تبيين) هاتووە. وە (من) بۆ (ظرفية)يش بەكاردێت، وەك: (ماذا خلقوا من الأرض) كە لێرەدا (من) چونكە بۆ ظە رفە لەسەر واتای (من) هاتووە. بۆ ئیعرابی ئەو ئایەتە ئەم ئیحتیمالانە هەیە: 1-(ماذا): ئیستیفهامیە بێت، (ذا): ئیشارەیە، وەك (ماذا التواني). 2-(ماذا): ئیستیفهامیە، (ذا): مە وصولەیە كە جوملەكەی دوای (صیلەیە) بۆی. لێرەدا (ما) موبتەدا و (ذا) خەبەرە. (خلقوا): فيعل وفاعيل. (من الأرض): جار ومەجرورەو موتەعەللیقە بە (خلقوا)ە،وەو (مفعول فيه)یە بۆی. 3-(ماذا): مەفعول بە، دووەم. (خلقوا): فیعلی موضاریع. (واو): فاعیلە. (من الأرض): جار ومەجرورە.وە بزانە كە لە كەلامی (منفی)دا (من) بۆ زائیدەیە، وەك (ما من إله إلا الله). (ما): نافیە. (من ): زائیدە،(إله): جار ومەجرورە، ئیعرابە تەقدیری یەكەی ڕەفعە. بە هۆی (ابتدائية)ەوە، (إلا الله): خەبەرە بۆ (إله). طنطاوي بەم شێوازە ئیعرابی دەكات: (ما): نەف. (من): حەرفی جەڕە. (إله): ئیسمی مەجرورە. (إلا): استثناء. (الله): مبتدأ مؤخر. (هل من خالق غير الله). (هل): ئیستیفهامیە. (من): حەرفی جەڕی زائیدە. (خالق): موبتەدایە. (غير): خەبەرە. (الله): موضاف إلیە. (لا تؤذ من أحد). (لا): ناهیە. (تؤذ): مضارع مخاطب. (من): حەرفی جەڕە. (أحد): ئیسمی مەجرورە، ومەفعول بە،یەوتەعەللوقی نەبەستوە. بزانە كە حورروفی جەڕی زائیدە تەعەللوق نابەستن.

وللتبعيض، نحو: أخذت من الدراهم، وللبدل، نحو: قوله تعالى: ﴿ ولو نشاء لجعلنا منكم ملائكة ﴾، وللتعليل، كقول الشاعر:

يغضي حياء ويغضي من مهابته          فلا يكلم إلا حين يبتسم

وە (من) بۆ (تبعيض)یش، واتە هەندێتی بەکاردێت، وك (أخذت من الدراهم). (أخذت): فیعل وفاعیلە. (من الدراهم): جارومەجرورە.و موتەعەللیقە بە (أخذت). وە بۆ (بدل)یش بەکاردێت، وەك ﴿ولو نشاء لجعلنا منكم ملائكة﴾. (واو): حەرفی ئیستیئنافە، یان( اعتراض)ە. (نشاء): فیعلی موضاریعە. و فاعیلەکەی (نحن)ە. (لام): ابتداء للتأكيد. (جعلنا): فیعلی ماضی یە. (نا): فاعیلە. (ملائكه): مەفعول بە. (منكم): جار ومەجرورە. مەبەست لێرەدا (من)ە کە بۆ (بدل) بەکارهاتووە.

وإلى: لإنتهاء الغاية. مكانا، نحو: سرت من البصرة إلى الكوفة. أو زمانا، نحو: أتموا الصيام إلى الليل، أو غيرهما، نحو: قلبي إليك، وتكون بمعنى: مع قليلا، نحو: ولا تأكلوا أموالهم إلى أموالكم.إلى: بۆ (انتهاء غاية) کۆتایی مەبەستە.

1.مەکانی: وەك: سرت من البصرة إلى الكوفة. ئیعرابەکەی ڕابورد.

2.زەمانی: وەك: أتموا الصيام إلى الليل. (أتموا): فیعل و فاعیلە. (صيام): مەفعول بە،یە. (إلى الليل): جار ومەجرورە.و موتەعەللیقە بـە(أتموا).

3.پەیوەست نی یە، نە بە زەمان، نە بە مەکانەوە، وەك: (قلبی إليك) کە لێرەدا شتێکی مەعنەوی یە، واتە: (سير القلب إلى المحبوب). (إلى): حەرفی جەرە.( کاف): ئیسمی مەجرورە. وە بزانە زۆر بە کەمی (إلى) لەسەر واتای (مع) دێت، وەك: (ولا تأكلوا أموالهم إلى أموالكم) (و):حەرفی عەطف. (لا):

حەرفی جەزمە. (تأكلوا): فيعل وفاعيلە. (أموالهم): مەفعول بە،یە. (هم): مضاف إليە. (إلى): حەرفی جەڕ. (أموالكم):ئیسمی مەجرورە، (كم) مضاف إليە. مەبەست لێرەدا (إلى)یە، كە بە واتای (مع): هاتووە، واتە: (مع أموالكم).

والباء: للإستعانة، نحو: "بسم الله الرحمن الرحيم"، وللمصاحبة، نحو: "دخلت عليه بثياب السفر"، ومنه:" سبحان ربي العظيم و بحمده"، وللألصاق، أما حقيقة، نحو: "به داء"، أو مجازا، نحو: "مررت بزيد"، أي :قرب مروري منه. (الباء): بۆ (استعانة:پشت پێ بەستن) بەكاردەهێنرێت، وەك (بسم الله الرحمن الرحيم) (باء): حرف جر، لـلإستعانه. (اسم): اسم مجرور، متعلق بعامل مقدر، وهو (إبتدأ)، وهو مضاف. (إليه): مضاف إليه.(الرحمن): نعت. (الرحيم): نعت.وە بۆ "مصاحبە"ش، ئەم نموونەیە هەیە: (سبحان): مەصدەرە، یاخود ئیسمی مەصدەرە، ومەصدەرەكەی (تسبیح)ە، جا (سبحان) مەفعولی موطلە قە بۆ (أسبح)ی موقەددەرە، وە هۆی مەنصوب بونی (سبحان) مەصدەرە، وهو مضاف. (ربی): (رب): مضافە بۆ لای (یاء) كە، (متكلم مع الغیر)ە، وە هۆی مەفتوحی (یاء)ەكە، لەبەر خەفیفی یە، چونكە "یاء متكلم"مەسكون بوو، وە (لام)ی (العظیم): هەم ساكنە، لەسەر یاسای (إذا التقى الساكنان حرك بالكسر). (یاء): كەسرەی پێ درا، بەڵام لەبەرئەوەی كەسرە، بۆ سەر (یاء)، (ثقیل) گرانە، بۆیە فەتحە بە سوكترینی حەرەكات دانرا، بۆیە كەسرەكە كرا بە فەتحە. (العظیم): صیفەتە بۆ (رب). (بحمده): (باء): بۆ موصاحەبەیە، (حمد) مەجرورە، بە هۆی (باء)ەوە، وهو مضاف. (هاء): مضاف إليه. وللمقابلة، نحو: بعت هذا بهذا، وللتعدية، نحو:

ذهبت بزيد أي صيرته ذاهبا. وللقسم، نحو: بالله لأفعلن كذا، وللسببية، نحو: ضربت بسوء أدبه، وللبدل، نحو

فليت لي بهم قوما إذا ركبوا     شنوا الأغارة فرسانا و ركبانا

وه (باء) بۆ (مقابلة)، واته بەرامبەرێتی بەکاردێت، وەك: (بعت هذا بهذا). (بع): فيعلی ماضي يه كه ئەصڵەکەی (بَيَعَ)يه. (ت): فاعيله. (هذا): محلا منصوب مفعول به. (بهذا): جار ومەجرورەوتەعەللوقی بەستوه به (بعت) وە،و مەفعول به غەيره صەريحە. وه بۆ (تعدية) تەعەدا كردنيش بەكاردێت، وەك (ذهبت بزيد). (ذهبت): فيعل وفاعيله. (بزيد): ئيسمی مەجرورە،و موتەعەللیقه بـه (ذهبت) كه واتاكەی يانی (صيرتة ذاهبا).واته زەيدم ڕەوانه كرد يا خستمه ڕۆيشتن، كه بۆ (تعدية)يه. وه (باء) بۆ (قسم:سوێند)يش بەكاردێت، وەك: (بالله): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقه بـه(أقسمت)ی موقەددەره، (لام):موطئة. يان جەواب قەسەمە. (أفعل): فيعلی موضاريعه وفاعيلەكەی (أنا)يه. (ن): تە وكيدي ثه قيله يه. (كذا): مەفعول به،يه بۆ( افعل). وه بۆ "سەبەبيەت"هۆكار، به كار دێت ،وەك"ضربت بسوء أدبه"لەبەر :یّ ئەدەبی لێیم دا. "ضربت"فيعل و فاعيله "بسوء"جارومەجرورە و، موتەعەللیقه به (ضربت)وهو مضاف "أدب"مضاف أليه ، وهو مضاف "الهاء" مضاف أليه. لێرەدا چەند (ئیضافه)یەك به شوێن يەكدا هاتوون كه به( تتابع الاضافات )ناو دەبرێت .كه بريتی يه له به دوای يەكدا هێنانی موضافەكان له زمانی عەرەبيدا وەك ئەم دێڕە هۆنراوەيه:

حمامة جرعا حومة الجندل أسجعی     فانت بمرأى من سعاذ و مسمع .

واته:ئەی کۆترە باریکەی مەملەکەتی بەردەلان،دە بخوێنە،تۆ لە وڵاتی سوعادی خۆشەویستمای،ئەو تۆ ئەبینێت وگوێشی لە دەنگت ئەبێت! کە لەم بابەتەدا (حمامة ) بۆ لای (جرعی ) و (جرعی ) بۆلای (حومة) و (حومة) بۆ لای (جندل ) ئیضافە کراوە .یادی بەخێر ئەم شیعرەم لەسەر(مختصر)ی،تەفتازانی ولەشاری مەریوان،لەمزگەوتی بیلالی حەبەشی ولە خزمەتی(مامۆستا حەمەیوسفی ڕەهنمون)دا خوێند! ئەم دێڕە هۆنراوەیەی مامۆستا قانع،نمونەیەکی کوردی ئەم بابەتەیە:

ئەی وەتەن دیسان بەهارە،ئارەزوی سەیرانمە

مەیلی هاژەی قەڵبەزەی،بەفراوی کوێستانانمە.

بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێت کە (تتابع الاضافات) لە جێگایەکدا کە لە فزەکەی ناڕەحەت و گران دەکرد ، و دەربڕینەکەی دەشێواند .ئەوە پێچەوانەی (فصاحة ) ی زمانی عارەبە.

وە (باء) بۆ (بدل) بەکار دێت، وەك ئەم شیعرە:

فليت لي بهم قوما إذا ركبوا          شنوا الأغارة فرسانا و ركبانا

(فاء): عاطفه. (ليت): حرف مشبه بالفعل. (لي): جار ومجرور، متعلق بعامل مقدر وخبر (ليت). (قوما): اسم ليت. (بهم): جار ومجرور، متعلق بعامل مقدر. (إذا): شرطيه. (ركبوا): فعل وفاعل. (شنوا): فعل ماضي. (الإغارة): مەفعول بە،یە. بۆ (شنوا) یان (مفعول لە)یە، بۆ (شدوا)، چونکە هەندێك (شنوا) یان بە (شدوا) خوێندووەتەوە. (فرسانا): حاڵە. (ركبانا): عە طفە، لەسەر (فرسانا). مەبەست لێرەدا (بهم)ەکە بۆ بەدەل بەکار هاتووە. وللتفدية، نحو: بأبي أنت وأمي، وبمعنى عن، نحو: سئل سائل بعذاب

واقع، (باء) بۆ (تفديه)، (فيدا كردن) بەكار دێت، وەك: بأبي: جار ومەجرور، وموتەعەللیقە بـە(فداى)، فیعلی ماضی مۆقەددەر، یان" مفدىٌّ فداى بأبي." خەبەر موقەددەم. "أنت": موبتەدایەودواکەوتوە. (وأمي): واو: عاطفه، أمي: مەعطوفە بۆ (أبي) کە ئەصڵەکەی (أنت مفدى بأبي وأمي) یان (فدیتك بأبي وأمي) بووە. وە (باء) لەسەر واتای (عن) دێت وەك: (سئل): فیعلی ماضی یە. (سائل): فاعیلە. (بعذاب): جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بـە(سئل). (واقع): صیفەتەبۆ (عذاب).

وبمعنى في، نحو: بيدك الخير، وبمعنى اللام، نحو: وإذ فرقنا بكم البحر، وبمعنى من، نحو: عينا يشرب بها عباد الله. وتكون زائدة قياسا، في ثلاثة أخبار: الأول: خبر ليس، نحو ليس زيد بقائم. والثاني خبر (ما) النافية، نحو: ما زيد بقائم. والثالث: خبر مبتدأ، مقرون بهل، نحو هل زيد بقائم. وسماعا إما في غير الخبر، نحو: بحسبك زيد. وكفى بالله شهيدا، والقى بيده. وإما في الخبر غير ما ذكر، نحو: حسبك بزيد. وە (باء) لەسەر واتای (فی) دێت، وەك: (بیدك): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقە بـە(ثابت)ی،موقەددەرە،وموضافە بۆ لای (کاف) و خبر مقدم. (الخير): مبتدأ مؤخر. وە (باء) لەسەر واتای (لام) دێت، وەك: (و): عاطفة، (إذ): مەفعول فیه بۆ (اذکروا)ی موقەددەرە. (فرقنا): فیعل وفاعیل. (بكم): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقە بـە (فرقنا). (البحر): مەفعول بە. وە (باء) لەسەر واتای (من) دێت، وەك: (عینا): بەدەل. (یشرب): فیعلی موضاریعە. (بها): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقە بـە (یشرب). (عباد): فاعیلە، وهو مضاف. (الله): مضاف إلیه. مەبەست لەم نموونەیە (باء)ە کە لەسەر واتای (من) هاتووە:أی: (منها). (باء) بە زائیدەیی دێت، بە دوو شێواز، (قیاسی و سماعی). (قیاسی)یەکەی لە سێ شوێندایە: 1-لە خەبەری

(ليس)دا، وەك: ليس زيد بقائم. كە زيد: ئيسمي (ليس)ەيەو (قائم): خەبەری(ليس)ەيەو (باء): زائيدەيە. 2-خەبەری (ما)ی نافيە: وەك (ما زيد بقائم)، (ما): نافيەيە، (زيد): ئيسمی (ما)يە، (بقائم): خەبەری (ما)يە، كە (باء): زائيدەيە. 3-لە خەبەری موبتەدايەكدا كە سەرەتاكەی (هل)ی ئيستيفهاميە بێت، وەك: (هل زيد بقائم)، كە (زيد) موبتەدای وەصفی يە، (بقائم): خەبەرە، كە (باء): لێرەشدا بۆ زائيدەيە. وە (سماعی)يەكەيشی بەم شێوازەيە: 1-(باء) لە غەيری (خبر)دا، وەك بچێتە سەر موبتەدا، وەك:(بحسبك زيد). كە (بحسبك): موبتەدا. (زيد) خەبەر. وە (باء) زائيدەيە، بەڵام ئەگەر (بحسبك) خبر مقدم و (زيد) مبتدأ مؤخر بێت، لێرەدا (باء) زائيدە نی يە. كفى بالله شهيدا، كە: (كفى): فيعلی ماضي يە. (بالله): جار ومەجرورە. (الله) في محل رفع فاعل. (شهيدا): تمييز. كە (باء) لێرەدا چووەتە سەر غەيری (خبر) كە فاعيلە، كەوابوو زائيدە. نموونە بۆ فاعيلی مەجازی وەك: ألقى: فعل ماضي. (بيده): جار ومجرور. (يد) في محل رفع فاعل. كە (باء) چووەتە سەر (فاعل)، كەوابوو مەجازی يە.

2-يان (باء) لە خەبەرێكدا بێت كە خاوەنی ئەوە نەبێت، كە لە قياسی دا باس كرا: وەك(حسبك بزيد). كە (حسبك): موبتەدا، (زيد): خەبەر. وە (باء): لێرەدا زائيدەيە، كە لێرەدا (زيد) خەبەر نی يە بۆ موبتەدايەك كە "هل"ی پێوە بێت،(مقرون بـ"هل") تا قياسی بێت، وە (خبر)يش نی يە بۆ (ليس) و (ما)ی نافيە.

وفي: للظرفية،حقيقة،نحو: الماء في الكوز، ومجازا، نحو: النجاة في الصدق. كما أن الهلاك في الكذب، وبمعنى على قليلا، نحو: ولأصلبنكم في جذوع النخل.

یەکێکی تر لە حەرفە جەڕەکان (فی)یە، کە بۆ (ظرفية) بەکاردێت، واتە قەرارگرتنی شتێك لە نێو شتێکی تردا، وەك: (الماء فی الکوز) (الماء): موبتەدا. (فی الکوز): جار ومەجرورە.و موتەعەللیقە بـە(ثابت)ی، موقەددەرە،و خەبەرە بۆ (الماء) یان (النجاة): موبتەدا. (فی الصدق): جار ومەجرور. (أن): حەرفی موشەبیهـ بیلفیعلە. (الهلاك): ئیسمی (أن)ەیە. (في الكذب): جار ومەجرورە. جا بزانە یەکەمیان حەقیقی یەو دووەم نموونەیان مەجازی یە. وە کەم جارانێکیش: (فی)- لەسەر واتای (علی) دێت، وەك: (ولأصلبنكم في جذوع النخل). وبمعنى اللام، نحو: أن امرأة دخلت النار في هرة حبستها، وتكون فعلا، نحو:"في بعهدك". وە (فی) لەسەر واتای (لام) دێت، وەك: (أن): حەرفی موشەبیهـ بیلفیعلە. (امرأە): ئیسمی" أن"ەیە. (دخلت): فیعلی ماضی یە. (ت): فاعیلە،و بۆ (امرأة) دەگەڕێتەوە. (النار): مەفعول بە،یە. "لەسەر ڕای صەحیح". (في هرة): جار ومەجرورە،و بە مانای (لام)ە. (حبستها): فیعل، فاعیل، مەفعول بە. وە (فی) لەسەر واتای (فعل) دێت، وەك (فی بعهدك). (في)، (ف، فیا، فوا، في) لە( وفی)، (یفی):هاتوە،وفیعلن. کە ضەمیری (أنت) تیایاندا موستەتیرە بە واجبی. (بعهدك): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقە بـە(فی)یەوە. مەبەست لێرەدا (فی)یە، کە لەسەر واتای فیعلەو یانی (پابەند بە ئافرەت). وعلی: للاستعلاء، أما حسا وهو ما يشاهد، نحو: زيد على السطح، أو حكما وهو ما لا يشاهد، نحو: عليه دين، وبمعنى في نحو: دخل المدينة على حين غفلة من أهلها. نموونەی یەکەم (حسی:هەستی)یە، واتە ئەوەیە کە دەبینرێ. نموونەی دووەم (حکمی)یە، واتە ئەوەیە کە نابینرێ و مەعنەوی یە. وە (علی) لەسەر واتای (فی) دێت، وەك: :" دخل المدينة على حين غفلة من أهلها". (دخل): فیعلی ماضي

به، وفاعیله‌کەی (هو)ەیه،:و بۆ (موسى) دەگەڕێتەوە. (المدينه): مەفعول به. (على حين): جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بـە(دخل)، ومەفعول فیه،یه، بۆی. (غفلة): موضاف إليه،یه. (من): حەرفی جەڕە. (أهل): ئیسمی مەجرورە،و موتەعەللیقە بـە(غفلة)ەوە، وهو مضاف (ها): موضاف إليه. وتكون اسما، ويلزمها من لا غير، نحو: ركبت من عليه، أي من فوقه، وقد تكون فعلا، نحو: إن فرعون علا في الأرض. وە (على) به ئیسمیی، دێت، لەو کاتەدا کە بە ئیسمیی دێت، پێویستە (من)ی بچێتە سەر، نەك غەیری (من)، وەك: (ركبت): فیعل وفاعیل. (من على) : جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بـە(ركبت)، وهو مضاف. (ـــه): مضاف إليه. جا بزانە لێرەدا (على) لەسەر واتای (فوق) هاتووە کە ئیسمە. واللام للإختصاص الملكي، نحو: المال لزيد، ولغير الملكي، نحو: الحمد لله، وللتعليل، نحو: ضربته للتأديب، وللقسم في التعجب كقول الشاعر:

لله يبقى على الأيام ذو حيد  بمشمخر به الظيان والآس

حەرفێکی جەڕی تر (لام)ە،وەك: (المال): موبتەدا. (لزيد): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقە بـە(حاصل) وخەبەری موبتەدایە . کە لێرەدا (لام) بۆ ئیختیصاصی مولکی یە."سەرمایەداری تایبەت".وە بۆ غەیری مولکیش هاتووە، وەك: (الحمد): موبتەدایە. (لله): جارومەجرورە،وخەبەرەکەی مەحزوفە. وە لام بۆ (تعليل)یش بەکار دێت، وەك: (ضربته): فیعل،وفاعیل،ومەفعول به. (للتأديب): جارومەجرورە،وموتەعەللیقە،بـە(ضرب). کە لێرەدا (لام) بۆ (تعليل)ە،

واتە: لێمدا بە هۆی ئەدەب دادانی یەوە. وە (لام) بۆ سوێندیش بەکار دێت، بەڵام بۆ تەعەججوب، وەك ئەم شیعرە:

لِلّٰهِ يَبْقَى عَلَى الأَيّامِ ذُو حِيَدٍ          بِمُشْمَخِرٍّ بِهِ الظَّيّانُ وَالأسُ

ئەم دێرە هۆنراوەیە،لە هۆندنەوەی "عبدالمناة الهذلی"یە، ورایش هەیە کە شاعیری تر گوتبێتیان.لە پێشیەوە ئەم دێرەی ترە، کەئەڵێت:
يَاحَيُّ إنَّ سِبَاعَ الْأرْضِ هَالِكَةٌ          وَالْأدْمُ وَالْعُفْرُوَالْآدامُ وَالْخُنُسُ

(لله): جار و مەجرورە، موتەعەللیقە بـە(أقسم) ی ،موقەددەرەوە، ئەم (لام)ە تەنها بۆ سەر (الله) دەچێت. (یبقی): فیعلی موضاریعە، ئەصڵەکەی (لا یبقی) بووە، کە (نُحاة) لە بابی (حذف لا)دا ئەم شیعرەیان هێناوە. (علی الأیام): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقە بـە(یبقی). (ذو حید): (ذو): فاعیلی (یبقی)یە، (حید): مضاف إلیه. (بمشمخر): جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بـە(یبقی). ـ کێوی بەرز– (بە): (باء): لێرەدا لەسەر واتای (فی)یە. (الظیان): نائیب فاعیلە بۆ (مشمخر). ـ گوڵی یاسەمەن–. (و الآس): عەطفە بۆ (الظیان). ـ ناوی درەختی مۆردە–.واتای شیعرەکە: بە خودا تەعەججوب دەکەم، لەو رۆژو رۆژگارانەی کە کۆتاییان دێت و باقی نامێنن، وەلەخاوەنی ئەو شاخانەی کە گوڵی یاسەمەن و درەختی مۆردی تیایە.ئەم دێرە شیعرە جۆرێك لە نۆستالۆژیای تێدایە،ومەبەستی ئەوەیە کەهەموو شتەکان کۆتاییان دێت.

وللتوقیت، نحو: أقم الصلاة لدلوك الشمس إلی غسق اللیل، وبمعنی عن مع القول، نحو: قال الذین کفروا للذین أمنوا، وبمعنی إلی، نحو: فسقناه لبلد میت. وە (لام) بۆ (توقیت:کات دیاری کردن)،بەکاردێت، وەك: " أقم

الصلاة لدلوك الشمس إلى غسق الليل" (أقم): فيعلى ئەمرە. (الصلاة): مەفعول بە. (لدلوك): جار ومەجرورە،وموتەعەلـليقە بـە(أقم) وهو مضاف (الشمس): مضاف إليه. (إلى غسق): جار ومەجرورە،وموتەعەلـليقە بـە(أقم) وهو مضاف. (الليل): مضاف إليه. وە (لام) لەسەر واتاى (عن) دێت، ئەمەش لە کاتێکدا کە (لام)ەکە لە دواى (قال، يقول)وە بێت، وەك:" قال الذين كفروا للذين أمنوا". (قال): فيعلى ماضى يە. (الذين): فاعيلە. (كفروا): فيعلى ماضىيە. (واو): فاعيلە. (للذين): جار ومەجرورە. (آمنوا): فيعلى ماضىيە، (واو): فاعيلە. مەبەست لێرەدا (لام)ە کە لەسەر واتاى (عن) هاتووەو دواى (قال) واريد بووە. وە (لام) لەسەر واتاى (إلى) دێت، وەك:" فسقناه لبلد ميت". (سقناه): فيعل،وفاعيل،ومەفعول. (لبلد): جار ومەجرورە،و موتەعەلـليقە بـە(سقى). (ميّت): صيفەيە بۆ (بلد).

وتكون زائدة، نحو قوله: ردف لكم، أي ردفكم. وتكون فعلا، نحو: لِ زيدا، وفيها معنى النفع كما أن في على معنى الضرر، نحو: دعالي ودعا عليه. وە (لام) بە زائيدەيى دێت، وەك:" ردف لكم": أي ردفكم. وە (لام) بە (فيعلى)ى دێت، وەك:" لِ زيدا". (لِ): فيعلى ئەمرە، و ضمیری (أنت)ى تيادا موستەتيرە بەواجبى. (زيدا): مەفعول بە،يە. ماناکەى: زەيدت خۆش بوێت. وە بزانە (لام) بە ماناى (نفع:سود) و(ضرر:زيان) دێت، واتە ئەو لامە لە جياتى ئەو دوو وشەيە بەکاردێت، وەك: (دعا لى): کە دۆعايە بۆ سوود. وە (دعا عليه): دۆعايە بۆ زيان. ويفتح في الإستغاثة، والتعجب والتهديد، نحو: يا لَزيدٍ، و يا لَلماء، و يا لَعمرو لَاقتلنك، وفي كل

مضمر إلا الياء ويكسر في غيرها. وه بزانه (لام) له كاتى (استغاثة:هاوار كردن)، وه (تعجب:سەرسوڕمان) و (تهديد: هەڕەشە)، به مەفتوحی دێت، وەك: 1.الإستغاثة: وەك: يا لَزيد. 2.التعجب، وەك: يا لَكماء. 3.التهديد: وەك: يا لَعمرو لَأقتلنك. وه (لام) بچێته سەر هەر ضه میرێك جگە لە (ياء) مەفتوح دەبێت، وەك (لە، لك، لهم)، بەڵام لە (لی)دا (لام) بە هۆی (ياء)ەكەوە مەكسورە. وه لە غەیری ئەم شوێنانەشدا (لام) مەكسور دەبێت.

وعن للمجاوزة، نحو: رميت السهم عن القوس، وللبدل، نحو: لا تجزى نفس عن نفس شيئا. وبمعنى بعد، نحو: لتركبن طبقا عن طبق، أي حالا بعد حال. (عن)یش حەرفێكە لە حەرفە جەڕەكان: وه (عن) بۆ (بدل) بەكار هاتووە، وەك:" لا تجزى نفس عن نفس شيئا". (لا): نافيە. (تجزى): فيعلى موضاريعە. (نفس): فاعيلە. (عن نفس): أى (بدل نفس). جار ومەجرورە،و موتەعەلليقە بـە(لا تجزى)يەوە. (شيئا): مەفعول بە. وه (عن) بە ماناى (بعد) دێت، وەك: (لام): جواب قسم. (تركبن): فعل مضارع، مؤكد بنون الثقيلة. (و): فاعل. (طبقا): مفعول به، به ماناى (حال)ە. (عن): حەرفی جەڕ. (طبق): ئیسمیی مەجرورە. كە (عن) لێرەدا بە واتاى (بعد)ە. و بمعنى على، نحو:

ولاه ابن عمك لا أفضلت في حسب عني ولا أنت دياني فتخزوني

و لاه مخفف لله، وتكون اسما مع من لا غير، نحو: جلست من عن يمينك. وه (عن) لەسەر واتاى (على) دێت، وەك ئەم شيعرە:

ولاه ابن عمك لا أفضلت في حسب عني ولا أنت دياني فتخزوني

(لاه): مخفف، (لله): جار ومجرور، وهو مضاف (ابن): مضاف إليه، وهو مضاف. (عم): مضاف إليه، وهو مضاف. (ك): مضاف إليه. (لا): نافية(. (أفضلت): فعل ماضي مخاطب مذكر. (في حسب): جار ومجرور، متعلق بـ(أفضلت). (عني): جار ومجرور، متعلق بـ(لا أفضلت). (و): عاطفه . (لا): نفي. (أنت): مبتدأ. (ديان): خبر، و عەطفه لەسەر (لا أفضلت). (فتخزوني): فاء: جواب. (تخزوني): فعل مضارع. (ن): وقاية. (ي): متكلم.

وه بزانه (عن) دەبێته (اسم)، ئەگەر لەگەڵ (من)دا بێت، وەك: (جلست): فيعل وفاعيل. (من عن): جار ومەجرورە. (من): ئیسمه به واتای "تەنیشت" هاتووه. (يمين): مضاف إليه، وهو مضاف. (ك): مضاف إليه. وحتى: للإنتهاء: ومدخولها، أما جزء ما قبلها، نحو: أكلت السمكة حتى رأسها، أو متصل به، نحو نمت البارحة حتى الصباح، وتفيد لمدخولها قوة، نحو: مات الناس حتى الأنبياء. یەکێکی تر لە حەرفە جەڕەکان (حتى)یە کە بۆ (انتهاء:کۆتایی) دێت، لەم کاتەدا ئەو ئیسمەی کە (حتى)ی چووەتە سەر، چەند جۆرێکە:

1.یان ئەوەیە کە ئەوەی (حتى)ی چۆتە سەر بەشێکە لە پێشی خۆی، وەك (ماسیەکەم خوارد تەنانەت سەریشی)، کە لەم نموونەیەدا (رأس)،(حتى)ی چۆتە سەر، وە ئەو بەشەی پێش (حتى) کە (سمكة)یە بەشێکە لـێی. بەهەرحاڵ لێرەدا (رأس) بەشێکە لە (السمكة) وەك: (أكلت): فیعل وفاعیل. (السمكة): مەفعول به. (حتى رأسِ): جارو مەجرورە،وموتەعەللیقە بـە(أكلت)، وهو مضاف (ها): مضاف إليه. 2.یان ئەوەیە کە ئەوەی

(حتى)ی چۆته سەر، لکاوه بەوەی پێشی خۆیەوە، وەك (شەو خەوتم تەنانەت ڕۆژیش خەوتم)، کە لێرەدا (الصباح) بەشێك نی یە لە (البارحة: شەو)، بەڵکو لکاوه پێیەوەو لە دوایەوە دێت، وەك: (نمت): فیعل وفاعیل.(البارحة): مەفعول بە. (حتى الصباح): جار ومەجرورە،وموتەعەللیقە بـە(نمت). 3–یان ئەوەیە کە ئەوەی (حتى)ی دەچێتە سەر، دەبێتە هۆی (قوة) هێز، گرنگی لێنانی، وەك: (مات): فیعلی ماضی یە. (الناس): فاعیلە. (حتى الأنبياء): جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بـە(مات). کە لێرەدا (حتى) چۆتە سەر (الأنبياء) کە واتای (تەنانەت) دەگەیەنێ، کە ئەمەش گرنگی پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) دەردەخات.

**أو ضعفا، نحو: قدم الحاج حتى المشاة، وتكون للإستيناف فما بعده مبتدأ، وللعطف، فكالمعطوف عليه وأول الأمثلة يحتمل هذين أيضا، وشذ دخولها على الضمير، نحو:**

**فلا والله لا يبقى أناس فتى حتاك يابن ابي زياد**

4.هەندێ جار ئەوەی (حتى)ی دەچێتە سەر، دەبێتە هۆی لاوازی پێگەی ئەو، وەك: (قدم): فیعلی ماضی یە. (الحاج): فاعیلە. (حتى المشاة): جار ومەجرورە،و موتەعەللیقە بـە (قدم). مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە (حتى المشاة) واتە: تەنانەت پیادەکانیش کە لێرەدا زەعیفی پیادەڕەو، دەردەخات. وە بزانە (حتى) هەندێ جار دەبێتە حەرفی (استئناف)، جا لەم کاتانەدا دەکەوێتە سەرەتای جوملەوە،و دواکەیشی دەبێتە موبتەدا. وە بزانە (حتى) هەندێ جار بە (عطف) دێت، جا لەو کاتەدا (حتى)،وە "معطوف عليه" ، وەك یەك دەبێت، وەك: (أكلت السمكة): فیعل،وفاعیل،ومەفعول بە. (حتى رأسَها):

(بفتح السين): (حتى): حەرفی ئیستیئنافه. (رأس): موبتەدایه.وخەبەرەکەی مەحزوفه. وە یان (حتى): عاطیفه،یه . (رأسها): (بفتح السين): ئیسمی مەعطوفه، تاوەکو ئیعرابی (السمكة) کە مەفتوحە وەر بگرێت. وە بزانە بە شازی ودەگمەنی (حتى) دەچێتە سەر ضە میر، وەك لەم شیعرەدا هاتووە:

فلا والله لا يبقى أناس فتئ حتاك يابن ابي زياد

(لا): زائیدەیە.(والله): جارو مەجرورە. (لا): نافیە.(یبقى): فیعلی موضاریعه. (أناس): بەدەلە،بۆ (فتى). مەبەست لێرەدا (حتى)یە،کە چۆتە سەر (کاف) کە ضە میرە. تێبینی: جیاوازی نێوان (حتى) و (ألی) کە هەردوکیان بۆ (أنتهای غایة:کۆتایی مەبەست) بە کار دێن، ئەوەیە کە دوای (حتى)دەکەوێتە ژێر حوکمی پێشی خۆیەوە، بەلاَم دوای "ألی"ناکەوێتە ژێر حوکمی پێشی خۆیەوە. و ربَّ: للتقليل، نحو: رب رجل كريم لقيته، ورب رجل صالح عندي و تكون للتكثير، نحو: رب رجل فقيرا أغنيته، ولها صدر الكلام، وتختص بنكرة، موصوفة وفعلها ماض محذوف غالبا، نحو: رب عصى كسرته. وە (رب) یەکێکی ترە لە حەرفە جەڕەکان و بۆ (تقليل:کەمێتی) بەکار دێت. وە هەروەها وەك:" رب رجل فقيرا أغنيته". (رب رجل): جار ومەجرورە. (صالح): صیفەتە. (عندی): ظە رفە. وە (رب) بۆ (تكثير:زۆرایەتی) بەکار دێت، وەك: :" رب رجل فقيرا أغنيته". (رب رجل): جار ومەجرورە. (فقير): صیفەتە. (أغنيته): فیعل وفاعیل ومە فعول بە. وە بزانە (رب) لە سەرەتای جوملەوە دێت، وە سەر ئیسمی نەکیرەیش دەچێت، وە پێویستە ئەو ئیسمەیش مەوصوف بێت. وەك: (رب رجل كريم). وە زۆر جار فیعلی (رب) مە حذوفە، وە جگە لە (ماضي) فیعلی

تر نابێت، وەك كەسێك دەپرسێت: (ما كَسَرْتَ) چيت شكاند؟ لە وەڵامدا دەڵێيت: (رب عصی كسرته)، چونكە شكاندن بۆ مرۆڤ مايەی شانازی نی يە، بۆيە (تقليل)ە. جا بزانە لێرەدا فيعلی (رب) حە ذف بووە، وە لە فە صلە كە دا تە فسير دەكرێت، هەر لەبەر ئەوەيە، كە موتەعەللیقی، (رب) بە زۆری فيعلی ماضي مە حزوفە. والله أعلم. وتدخل على مضمر مبهم مميز بنكرة منصوبة، على طبق ما قصد أفرادا، وتثنية و جمعا وتذكيرا وتأنيثا. والمضمر مفرد مذكر لا غير، نحو: ربه رجلا ورجلين ورجالا وامرأة.وامرأتين ونساء. بزانە (رب) سەر ضە ميرێك دەچێت كە موبهەم، بێت وتەميزێكی هەبێت. وە ئەو تەميزەش،نەكيرە و مەنصوب، بێت. بەهەرحاڵ (رب) هەميشە بە موفرەدی دێت، با ئەوەی كە (رب)ەكەی چووەتە سەر (مفرد، تثنية، جمع، مذكر يان مؤنث)بن، وەك:

1.ربە رجلا: (رجلا): تەميزە بۆ ضە ميرە موبهەمەكە،كە (مفرد ومذكر)ە.

2.ربە رجلين:بۆ تەميزی (تثنية) هاتووە، بەڵام ضە ميرەكە ،مذكرە.

3.ربە امرأة: تەميزی( مؤنث) هاتووە، كەچی ضە ميرەكە موفرەدەو موزەككەرە.

4.ربە امرأتين: تە ميزی تە ثنيە ی مؤنثە، كە چی ضە ميرەكە موفرەدی موزە ككە رە.

5.ربە نساء: تەميزی جەمعی مؤنثە، كەچی ضە ميرەكە موفرەدی موزەككەرە.

وه بزانه هەمیشه ئەو ضـه میره، موفرەدی موزەککەره. وتلحقها ما فتكفها عن العمل غالبا، وتدخل على قبيلتين، نحو: ربما قام زيد، وربما زيد قائم وقد تخفف، نحو قوله تعالى: ربما يود الذين كفروا لو كانوا مسلمين. وه بزانه (ما)ی (کافه) دەچێته سەر (رب) و لـه کاری دەخات زۆر جار، وه ئەمەش لـه (قبيلتين)، واته (جوملەی ئیسمیه وفیعلیه)دا ڕوو دەدات، وەك (ربما قام زيد) كه لێرەدا (ربما) چووەته سەر جوملەی ئیسمیه. وه بزانه هەندێ جار (رب) به تەخفیفی واته به بێ (شَدَّة) دێت. وەك ئەم ئایەته: "ربما يود الذين كفروا لو كانوا مسلمين". (ربما): موخەففەفی (ربما)یه، (ما) :كافه. (يود): فیعلی موضاریعه. (الذين): فاعیله. (كفروا): فيعل وفاعیله. (لو كانوا): (لو): شرطية، (كان): ئەفعالی ناقیصەیه. (واو):ئیسمی (كان)ەیه. (مسلمين): خەبەری (كان)ەیه. والواو: تكون بمعنى (رب) فتدخل على النكرة، الموصوفة، وفعلها، كفعلها، نحو:

وبلدة ليس لها أنيس          إلا اليعافير وإلا العيس

وه بزانه كه (واو) به مانای (رب) دێت، جا لـەو كاتەدا دەچێته سەر نەكیرەیەكی مەوصوفه، وه فیعلی ئەو (واو)ە، وەك فیعلی (رب) ماضـي مه حذوفـ دەبێت به زۆری. وەك ئەم شیعره:

وبلدة ليس لها أنيس          إلا اليعافير وإلا العيس

(وبلدة): أی: (رب بلدة). ئەم دێڕە،شیعری،عامیری كوڕی حاریسه،كەبه،"حبران العود النمری"،ناسراوه، واته:هەی،لـه شارێك كه جگه لـەگوێرەكەی وەحشی و حوشتری سپی،سورباو هیچی تری تیا نی

يه.كه"واو"،تيايدا بەماناى "رب"هاتوه. "يعافير"،جەمعى،"يعفور"ە،وماناى گويرەكەى وەحشى هەيە،و "العيس"، بەماناى حوشترى سپى،سورباوهاتوه.

وللقسم، نحو: والله ما فعلت كذا، ويختص بالظاهر ويحذف فعله، ويجاب بغير الطلب، فلا يقال: وك ولا أقسم والله ولا والله أخبرني أو لا تخبرني. (واو)ى قەسەم: سويند، وەك: " والله ما فعلت كذا". (والله): جار ومجرور، متعلق بـ(أقسم)، محلا منصوب مفعول بواسطة. (ما): نافيه. (فعلت): فعل وفاعل. (كذا): محلا منصوب مفعول به. بۆ (واو)ى قەسەم سێ مەرج هەيە:

1.(واو)ى قەسەم سەر ئيسمى "ظاهر:ئاشكرا" دەچێت، وەك (والله)، بۆيە سەر ضه مير ناچێت، وەك (وكَ).

2.فيعلى قەسەم مه حذوفه، بۆيه (أقسم والله) هەلّەيەو نابێت.

3.جوابى قسم نابێت داوا بكرێت، بۆيه (والله أخبرنى) نابێت. وه (لا تخبرنى) نابێت.

والتاء للقسم، ويختص بلفظ الله ويحذف فعله، وشذ مع السؤال، نحو:

تالله يا ظبيات القاع قلن لنا ليلاي منكن أم ليلى من البشر

و باء القسم، أعم منها، نحو: لا أقسم بيوم القيامة وبك أخبرني. (تاء) يەكێكه له حەرفه جەرِەكان: وه تايبەته به لە فظى (الله)وه، بۆيه (ترب) نابێت، وه فيعلى (تاء) مه حزوفه، و موتەعەللیق به (أقسم) دەبێت. وه (تاء) بۆ پرسيارو داواكارى به (شاذ)ى و كەمى دێت، وەك ئەم شيعره:

تالله يا ظبيات القاع قلن لنا ليلاي منكن أم ليلى من البشر

(تالله): جار ومجرور، متعلق بـ(أسأل) مقدره، كه لێرەدا (تاء) بۆ پرسيار هاتووە. (يا): نداء. (ظبيان): منادى. چونكه موضافه، منصوبه، بۆيه: وهو مضاف: (القاع): مضاف إليه. (ليلاي): مبتدأ. (أم): متصلة. (ليلى): مبتدأ. (من البشر): جار ومجرور، متعلق بـ(ثابت) المقدر، وه (خبر)ه بۆ (ليلى). واتاى شيعرەكه: پرسيار دەكەم، يان سوێند دەدەم، ئێوه به خوا، ئەى ئاسكەكانى بيابان، پێمان بڵێن: كه (ليلا)ى من لە جينسى ئێوەيه يان لە جينسى مرۆڤە؟وه بزانه ئەى كەسێ كه ئەتەوێ فێرى زانيارى بى: (باء)ى قەسەم دەتوانرێ (أقسم)ى لەگەڵدا بێت، كه فيعله، وەك: (لا): زائده يان نافيه. (أقسم): فيعلى موضاريعه وهو مضاف. (القيامه): مضاف إليه. وه (باء)ى قەسەم دەچێته سەر ضەمير وەك: (وبك أخبرني).

ولابد لجواب القسم في غير السؤال من إحدى الأربعة، اللام وأن وما و لا ولو تقديرا، نحو: تالله تفتؤا تذكر يوسف أي لا (تفتؤ) ويحذف الجواب إذا توسط القسم بين أجزاء ما يدل عليه أو تأخر عنها، نحو: زيد والله قائم، وزيد قائم والله. وه بزانه كه پێويسته له جەوابى (قسم)دا ئەگەر بۆ غەيرى (سؤال) هاتبوو، ئەم حەرفانه (لام، أن، ما، لا) يا له تەقديريشدا بێت، چونكه (المقدر كالمذكور) بەكار بهێنرێت، وەك: (تالله تفتؤ تذكر يوسف) كه ئەصڵەكەى (لا تفتؤ)يه. (تالله): جار ومەجرورە، وموتەعەللیقە بـه (أقسم). (تفتؤ): أفعال ناقصة. (أنت)ەى حەزف كراو، ئيسمى(كان)ەيه. تذكر: فيعلى موضاريعه (أنت): فاعيله. يوسف: مەفعول به. وخبر (تفتؤ)

محذوف. وه بزانه كه حەزفى جەوابى قەسەم دەكرێت كاتێك كە: 1-ئەو (قسم)ە كەوتە ناوەڕاست، وەك (زيد والله قائم). 2-كاتێك كە ئەو (قسم) كەوتە كۆتايى، وەك (زيد قائم والله).

والكاف للتشبيه نحو: زيد كالأسد، وللتعليل، نحو قوله تعالى: واذكروه كما هداكم، وتلحقها ما الكافة، نحو:

أخ ماجد لم يخزني يوم مشهد          كما سيف عمر ولم تخنه مضاربه

(كاف)يش يەكێكە لە حەرفە جەڕەكان و بۆ (تشبيه) بەكار دەهێنرێوە (كاف) بۆ (تعليل)يش دەبێت، وەك ئەم ئايەتە پیرۆزە. "واذكروه كما هداكم"، (و): عاطفة. (اذكروا): فعل أمر. (واو): فاعل. (هاء): مفعول. (ك): كاف علة: حرف جر. (ما): موصولة، "يان" مصدرية. (هدى): فعل ماضي. (كم): مفعول و فاعله ضمير مستتر تقديره (هو). وه بزانه (ما)ى (كافه) دەچێتە سەر (كاف) وەك ئەم شيعرە:

أخ ماجد لم يخزني يوم مشهد          كما سيف عمرو لم تخنه مضاربه

(أخ): خەبەرە بۆ (مبتدأ)يێكى مەحذوف كە (هو أخ) بووە. (ماجد): صيفه. (لم يخزني): لە ئەفعالى (جحد)ە. (ن): ويقايه. (ى): مەفعول. (يوم): مەفعول فيه، وهو مضاف (مشهد): موضاف إليه. (ك): كاف تشبيه. (ما): كافة. (سيف): مبتدأ، وهو مضاف (عمر): مضاف إليه. (لم تخنه): جازمة، فعل، (هاء) مفعول. (مضاربه): مضاف إليه. (هاء): فاعل (لم تخنه). والمصدرية نحو:

فلما أصبح الشر وأمسى وهو عريان

فلم يبق سوى العدوان دناهم كما دان

والزايدة، نحو: زيد أخي كما أن عمرا اخوك، وقد تكون زايدة، نحو قوله تعالى: ليس كمثله شيء، وتدخل الضمير على قلة، نحو: ما أنت إلا كانا. وه بزانه (ما)ى مەصدەريە دەچێتە سەر حەرفى جەرِ وەك ئەم شيعرە:

فلما أصبح الشر وأمسى وهو عريان

لم يبق سوى العدوان دناهم كما دان

(لما): جازمة. (اصبح): أفعال ناقصة. (الشر): اسم أصبح. (و): عاطفة، (أمسى): لە ئەفعالى ناقيصە يەو ضه ميرى (أمسى) دەبێتە ئيسمى" أمسى". (و): تأكيد. (هو): مبتدأ. (عريان): خبر. (وهو عريان): في محل نصب خبر (أمسى). (ف): عطف. (لم): جازمة. (يبق): فعل مضارع مجزوم بـ(لم). (سوى): فاعل وهو مضاف. (العدوان): مضاف إليه. (دنا): متكلم مع الغير. (نا): فاعل. (هم): مفعول به. ئەم جوملەيە جوابى (لام)ە. (كما): (كاف تشبيه)، (ما): كافه. (دان): ئەصلّەكەى (دانو) بووە، فيعل وفاعيل ومەفعولە. چونكە لێرەدا دەبرێتەوە سەر ئەصلّى مەصدەر.

ومذ ومنذ لإبتداء الغاية في الماضي، نحو: ما رأيته مذ ومنذ يوم الجمعة. وللظرفية، في الحاضر، نحو: مذ يومنا، ومنذ شهرنا، ويختص بالظاهر ويكونان اسمين بمعنى أول المدة فيليهما المفرد، نحو: ما رأيته مذ يوم الجمعة. "مذ ومنذ"دوو دانەن لە حەرفە جەرِەكان، كە بۆ سەرەتاى مەبەست لە زەمانى رِابردودا بەكاردێن، وە بزانە (منذ، مذ) بۆ (ظرفية) لە كاتى ئێستا

(حاضر)دا بەکار دێن. واتە لەسەر ماناى (فى) دێن، وەك: (مذ يومنا): جار ومجرور متعلق بـ(رأيت)، (نا): مضاف إليه. (منذ شهرنا): وەك پێشوو وايە. وە بزانە (مذ، منذ) دەبنە (اسم)يش، جا لەو كاتەدا، بە واتاى "سەرەتاى كات – أول المدة" دێن، جا لەم كاتەدا دەچنە سەر ئيسمى موفرەد و (تثنية وجمع) لەگەڵياندا نايەت، وەك:" ما رأيته مذ يوم الجمعة".

أو جميعها فيليهما ما قصد، نحو: ما رأيته مذ يومان، أو أيام فهما مبتدئان. وما بعدهما الخبر. وحاشا وعدا وخلا: للإستثناء، أي إخراج الشيئ عن حكم ما قبلها، نحو: ساء القوم حاشا و عدا وخلا زيد، وتكون فعلا فتنصب ما بعدها على المفعولية، والفاعل يستتر فيها وجوبا، والجملة منصوب المحل على الحالية، نحو: جاءني القوم حاشا زيدا، أي حال كونهم خاليا مجيئهم من زيد.

وە بزانە "خوا بتكاتە مەلەوانى بەحرى زانين"، كە: (حاشا، عدا، خلا) سێ حەرفى ترى جەڕن، كە بۆ (استثناء) بەكاردێن، واتە بۆ لابردن و دەركردنى شتێك لە حوكمى پێش خۆى، وەك: (ساء): فعل. (القوم): فاعل. (حاشا وعدا وخلا زيد): جار ومەجرور تەعەللوق نابەستن. وە بزانە ئەم پيتانە بە (فعل)ى دێن، جا لەو كاتەدا دواى خۆيان (منصوب) دەكەن، لەسەر "مفعول"يەت، وە "فاعل" تيايادا شاراوەيە بە واجبى، وە مەحەللى جوملەى هەرسێ فيعلەكە مە نصوبە، لەسەر "حال"يەت، وەك: (جاءني): فعل. (ن): وقايە. (ى): محلا منصوب مفعول. (القوم): فاعل. (حاشا): فعل، وفاعلە مستتر. (زيدا): مفعول بە، ومەحەللى جوملەى (حاشا زيدا) مەنصوبە، بە هۆى (حال)يەت، واتە حاڵيان وەهابوو كە هاتن زەيديان لەگەڵ نەبوو.

وتدخل على الأخيرتين ما المصدرية، فالجملة في تأويل المصدر، منصوب على الظرفية، بتقدير الوقت، نحو: جاءني القوم ما عدا زيدا، أو ما خلا عمروا، اي وقت عدوهم عن زيد، ووقت خلوهم عن عمرو. وه بزانه كه (عدا، خلا) (ما)ى مەصدەریەیان دەچێته سەر، لەو كاتەدا جوملەكە دەچێتەوە بۆ "تأويلى مصدر"، وە ئەو مەصدەرە بە هۆی "ظرفية"وە تەقديرى (وقت)ەوە مەنصوب دەبێت، وەك: (جاءني): فعل. (ن): وقايه. (ى): محلا منصوب مفعول. (القوم): فاعل. (ما عدا): لە تأويلى مەصدەرا دەبێته (عدوهم). كە لێرەدا (ما) مەصدەریەیە، (عدا زيدا): دەباتەوە سەر مەصدەر. كە مەصدەرى (عدا) (عدو)ە، كە ضـه ميرى جەمعى تيادا دەردەكەوێت، ئیتر لەم كاتەدا (مصدر) بە هۆی (ظرفية و تقديرى وقت)ەوە مەنصوب دەبێت، (أی وقت عدوهم من زيد). وە (زيد) دواى تەئویلەكە بە هۆی (عن)ەوە مەجرور كرا. (ووقت خلوهم عن عمرو) وەك پێشوو وايە. ومن جر الإسم بهما جعلها زايدة، ولابد لحروف الجر من متعلق إلا الحروف الزائدة، نحو: كفى بالله شهيدا، وكذا رب والكاف وحاشا وعدا وخلا. وە بزانە، ئەوەی كە (ما خلا، ما عدا) بە حورووف (جر) دابنێت، ئەوە ئەو (ما)يەی بە (زائده) حساب كردووە، نەك (مصدريه). وە بزانە حورووفی جەرِ پيوێستيان بە (متعلق) هەيە، تەنها ئەوانەيان نەبێت كە زائيدەن، وەك (كفى بالله شهيدا) كە (باء) زائيدەيە. وە هەروەها (رب، كاف، حاشا، عدا، خلا) پێویستیان بەمو تەعەلـليق نى يە.

النوع الثاني:

حروف مشبّهة بالأفعال، وهي ستة أحرف، إن، أن، كآن، ولكن،وليت،ولعل، وتدخل على المبتدأ والخبر، فتنصب الأول اسماوترفع الثاني خبرا،ولها سوى أن المفتوحة صدر الكلام ولها التوسط. فالأولان لتأكيد مضمون الجملة، لكن المكسورة لا تغيرها والمفتوحة مع جملتها في حكم المفرد، نحو: إن زيدا قائم، وبلغني أن زيدا راكب، وقد تخففان فإن المكسورة، قد تعمل نحو: وإن كلا لما ليوفينهم ربك أعمالهم. بزانه كه (إن) و (أن) بۆ تەئكيد بەكار دەهێنرێن. وە (إنّ) بە مەكسورى جوملەكە ناگۆڕێت، تەنها لە ڕووى ئيعرابەوە نەبێت، بەلأم (أن)ەى، مەفتوحە، جوملەكە دەگۆڕێت وە دەيباتە سەر حوكمى موفرەد، واتە (تأويلى مصدر)، وەك: (إن زيدا قائم)، گۆڕان ڕووى نەداوە، بەلأم لە (بلغنى أن زيدا راكب)دا (أن زيدا راكب) دەبرێتەوە سەر (تأويلى مصدر) و مەصدەرى (راكب) (ركوب)ە، وە ئەم (ركوب)ە دەبێتە فاعليى (بلغ)، وە موضاف دەبێت بۆ لاى ئيسمەكەى و عيبارەتەكە بەم شێوەيە دەبێت: (بلغنى ركوب زيد). وە بزانە هەندێ جار (إن و أن) تەخفيف (بێ شەددە) دەبن، وە (إن)ى مخفف هەندێ جار كار دەكات،وەك ئەم ئايەتە: " وإن كلا لما ليوفينهم ربك أعمالهم". (و): استئناف. (إن): حرف مشبه بالفعل. (كلا): اسم (إن).(لما): حرف جزم. (لام): قسم.(يوفين): فعل مضارع. (ن): تأكيد.(هم): مفعول به.(رب): فاعل.(ك): مضاف إليه. وخبر (إن) محذوف. (أعمالهم): مفعول به ثاني. (هم): مضاف إليه. وقد تلغى فيلزمها اللام، نحو: أن زيد لقائم. فرقا بينها وبين أن النافية، والمفتوحة تعمل وجوبا في ضمير الشأن مقدرا، نحو: أنِ الحمد لله رب العالمين. وە هەندێ جار (أن)ى موخەففەف لە عەمەل كردن

دەکەوێت، جا بۆیە لەو کاتەدا پێویستە (لام) لەویدا دەربکەویت، تا ببێتە هۆی جیاوازی جیاکردنەوەی لە (أن)ی " مخفف عن مثقل" لە (أن)ی نافیەدا، وەك: (أن): مخفف، أصلە (أنّ). (زید): مبتدأ. (لقائم): خبر. بە هۆی (لام)ی سەر (لقائم) (أن) لە عەمەل کەوت. وە بزانە (أن)ی مەفتوحەی (مخففە) بە واجبی عەمەل دەکات، لە (ضمیر الشأن) پێویستە مە حذوف بێت، وە ظاهر نەبێت، وەك: :" أن الحمد لله رب العالمین". (أن): مخفف عن مثقل و الضمیر الشأن اسمە. (الحمد): مبتدأ. (لله): جار ومجرور خبر ـــ لـ (مبتدأ). وە جوملەی (الحمد لله رب العالمین) خەبەرە بۆ (أن). چونکە ئەصلی ئایەتەکە: (آخر دعواهم حمد الله رب العالمین)بووە. مەبەست لێرەدا: (أن)ی مخففەیە، کە لە (ضمیر الشأن)دا عەمەلی کرد. وە بزانە کە (سیوطي) لە کتێبی (همع الهوامع بشرح جمع الجوامع)دا دەڵێت: (ابن مالك) وتویەتی: (چی کاری کردووەتە سەر (أن) کە "ضمیر الشأن"، واتە شاراوە ببێتە ئیسم بۆی؟).جا (أمام سیوطي) لە وەڵامدا دەڵێت: چونکە عەرەبەکان بە لایانەوە جوان نەبووە کە فیعل ڕاستەوخۆ لە دوای (أن) بێت. "دەربارەی ضمیر الشأن" (ضمیر الشأن):یان ضە میری (قصة) ئەوضە میرەیە کە موفرەدو غائیبە ،کەهەندێ جار لەسەرەتای جوملەوە کەبەمەبەستی بەگەورە دانان "تعظیم "و"تفخیم" دێت ،کەئەم ضە میرە بەجوملەکەی دوای خۆی تەفسیر دەکرێت ،هەڵبەتەئەگەر ئەوضە میرە غائیبی موزەککەر بێت ، ئەوە بە(شأن) ناودەبرێت . وەئەگەر (مؤنث) بێت بە (قصة ) ناودەبرێت .وە (ضمیر الشان) لە هەندێ جێگادا بەشاراوەیی (مستتر) دێت ،وەئەم ضە میری (شأن وقصة)ەیە ،لەچەند ڕوویەکەوە لەگەڵ دیکەی ضە میرەکاندا جیاوازیان هەیە: 1- ضە

كان (لا تفعل): في محل نصب خبر كان. و (ما) بەسەر (إن)دا زياد كرا، لـه جياتى مەحزوفەكە. وە هەندىَ جار نونى (يكون) مەحزوف دەبيّت، ئەگەر كۆتايى يەكەى (ضمير)ى پيّوە نەبوو، وە دواى (نون) ساكن نەبوو، وەك (لم أك بغيا)، كە ئەصلّەكەى (أكون) بووە، و نونەكە ضە ميرى پيّوە نى يەو بە ساكن كۆتايى نەهاتووە، وەك (لم يكنه)،" بسكون النون".وە (صار) بۆ گواستنەوەيە، وەك: (صار زيد غنيا) وە هەندىَ جار بە (تام)ى دێت، وەك (صار زيد إلى عمرو). (صار) فعل ماضي ناقص. (زيد): فاعل. (إلى عمرو): جار ومجرور، متعلق بـ (صار).

*(گواستنەوە: أنتقال) دوو جۆرە: 1-أنتقال بالعوارض: وەك: (صار البشر أميراً). 2-أنتقال بالحائق: وەك: (صار الماءُ هواءً).

وأصبح وأمسى وأضحى لإقتران مضمون الجملة بأوقاتها وهي الصباح والمساء والضحى، نحو: أصبح وأمسى وأضحى زيد أميرا، أي اقترن أمارته بتلك الأوقات وتكون بمعنى صار، نحو: أصبح أو أمسى أو أضحى زيد غنيا، وتامة بمعنى الدخول في تلك الأوقات، نحو: أصبح أو أمسى أو أضحى زيد أي دخل فيها. وە بزانە (أمسى، أصبح، أضحى) ڕستەكە بە كاتەوە دەبەستن، وەك: (أضحى زيد أميرا) زەيد چێشتەنگاوى بە پاشايى كردەوە. وە بە ماناى (صار) دێن، وەك: (أضحى زيد غنيا): واتە: زەيد بوويە دەولّەمەند. وە بە (تام)ى دێت، وەك: (أصبح زيد)، (زيد): فاعلە. كە بە (تام)ى هات، واتە چوونە ناوەوە لـەو كاتەدا. وظل وبات لإقتران مضمون الجملة بوقتهما، نحو: ظل أو بات زيد قائما، أي قام في جميع نهاره، أو ليله ويجيئان بمعنى صار، نحو: ظل أو بات زيد قائما، أي صار قائما وتامتين على

قلة نحو: ظلت أو بتّ بمكان كذا، أي كنت بها نهارا أو ليلا، وما زال وما برح وما فتيء وما أنفك لإستمرار ثبوت الخبر للإسم، نحو: ما زال زيد كريما أي استمر كرمه وكذا أخواته، ويلزمها النفي، ولو تقديرا، نحو: تالله تفتؤ تذكر يوسف. وما دام: للتوقيت وما فيها مصدرية، وما زال قبله كلام، نحو: إجلس مادام زيد جالسا. وە (ظل) و (بات) ڕستەکە بە گشتی بە کاتەوە دەبەستن، وەك: ظل زيد قائما: زەید هەموو ڕۆژ وەستاو بوو. یان هەموو شەوەکە. وە بە واتای (صار) دێت، وەك: (ظل زيد قائما)، واتە: "صار زيد قائما". (ظل و بات) بە کەمی بە (تام)ی دێت، وە بزانە: (ما زال و مابرح وما فتىء، ما أنفك) بۆ بەردەوامی مانەوەی خەبەر دێن بۆ ئیسمەکە، وەك: (ما زال زيد كريما)، واتە: زەید هەمیشە (كريما) بەخشندەیە، کە خەبەر بۆ زەید جێگیر کراوە. وە ئەم چوارە پێویستە (نفی، لا، ما) یان لەگەڵ بێت، ئەگەر تەقدیریش بێت وەك: (تفتؤ تذكر يوسف) کە ئەصڵەکەی (لا تفتؤ) بووە. (مادام) بۆ دیاری کردنی کاتە (توقيت)ە، وە ڕستەی دوایی خۆی دەباتەوە سەر تەئویلی مەصدەر، وە پێش (مادام) هەمیشە کەلام هەیە، وەك: (إجلس مادام زيد جالسا) کە لە تەئویلی مەصدەردا (إجلس دوام جلوس زيد) بووە.

وليس لنفي مضمون الجملة حالا، نحو: ليس زيد بخيلا، ويجوز تقديم أخبارها، كلها على أسمائها، نحو: كان قائما زيد، وأما عليها فيمتنع في ما دام واختلف في ليس وما يلزمه النفي ويجوز في البواقي. تنبيه: غير الماضي منها يعمل عمله، وليس في ليس تصّرف. فائدة: تسمى تلك الأفعال ناقصة، لأنها لا تتم بالمرفوع كسائر الأفعال. (ليس) مانای ڕستە لە زەمانی (ئێستا، حال)دا نەفی دەکات، وەك: (ليس زيد بخيلا) واتە لە ئێستادا. دروستە پێشکەوتنی خەبەر بەسەرئیسمی ئەم ئەفعالانەدا. وەك: (كان قائما زيد) کە (قائما) خەبەری

موقەددەمە بۆ (کان). بەڵام لە (مادام)ەدا،پێشکەوتنی خەبەر بەسەر نەفسی فیعلەکاندا دروست نی یە. وە لە (لیس)دا ئیختیلاف هەیە. وە لە ئەوانەدا کە (ما) لە پێشیانەوەیە، وەك (ما زال) ئیختیلاف هەیە ،کە خەبەر بەسەریاندا پێشکەوێت. وە لە فیعلەکانی تردا پێشخستنی خەبەر دروستە.

ئاگاداری: ئەفعالی ناقیصە دەگۆڕێن بۆ" موضاریع، أمر، اسم فاعل". بەڵام (لیس) جامیدەو ناگۆڕێ.

سوودێك:ئەم ئەفعالانە بە (ناقصة) ناو دەبرێن، چونکە بە مەرفوعی (فاعل) تەواو نابن، بەڵکو مەنصوبی خەبەریشیان پێویستە. ) * ئەفعالی ناقیصە سێ بەشن:

1.ئەو فیعلانەی کە خاوەنی موضاریع و وەصفن، وەك: (زال، فتی، أنفك، برح).

2.تەنها ماضی یان هەیە، کە فیعلەکانی (لیس وما دام)ەن.

3.ئەو فیعلانەی تر کە ماون.

## النوع الثامن

أفعال تسمى أفعال المقاربة، وهي كالأفعال الناقصة، إلا أنه إلتزم في خبرها المضارع إلا ما شذ وهي عسى وحرى واخلولق وكاد وكرب وأوشك وأنشأ وطفق وجعل وأخذ وعلق وهي لدنوّ الخبر للإسم رجاء أو حصولا، أو أخذا فيه. ئەمانەش: چەند فیعلێکن بە (أفعال المقاربة) ناو دەبرێن، وە ئەمانیش وەك ئەفعالی ناقیصە وان، ئیسم مەرفوع و خەبەر مەنصوب دەکەن، وە جیاوازی (أفعال المقاربة) لە (أفعال الناقصة) ئەوەیە کە ئەم (أفعال المقاربة)انە خەبەرەکەیان دەبێت (فعل المضارع) بێت، وە ئیسم نەبێت، ئەمەش بە (شاز)ی هەیە، کەوا نەبێت، وە لەمەولا باسی لێوە دەکەین. وە (أفعال المقاربة) لەمانەن: (عسى... ... علق). وە ئەم فیعلانە خەبەرەکانیان لە ئیسمەکانیان نزیك دەکەنەوە، هەندێکیان (رجاء) بە ئومێدەواری، وە هەندێکیان (حصولا) بە حاصڵ کردنی و هەندێکیان (أخذا فيه) واتە: بە دەست پێکردن لە خەبەردانەدا، کە لە شوێنی هەریەکەیاندا، ئەم سیانە دیاری دەکەین. إن شاء الله تعالى. والأول:عسى وحرى وأخلولق وخبرها مع أن، نحو: عسى زيد أن يقوم، ويجوز حذف أن في خبرها، نحو:عسى زيد يخرج. أي:عسى زيد خارجا. وإذا قدم الفعل، نحو: عسى أن يقوم زيد، فيحتمل التام و النقص، نحو:حرى زيد أن يقوم واخلولق السماء أن تمطر. یەکەم: (عسى، حرى، اخلولق) خەبەرەکەیان (أن)ی پێوەیە، وەك: (عسى زيد أن يقوم) وە دروستە ئەو (أن)ە لابېرێت لە خەبەرەکەدا، وەك (عسى زيد يخرج) کە ئەصڵەکەی (عسى زيد خارجا)ە، واتە ببرێتەوە سەرئیسم فاعیل تا بزانین کە (أن)ێك حەزف کراوە.

## "ڕونکردنەوە"

هەرکات لەپێش (عسى)دا، ئیسمێك بهێنرێت، لەم کاتەدا لە فیعلەکەدا دو شێواز (تام-ناقص) دروستە، وەك: (زيدٌ عسى أن يقوم) بۆیە لەسەر شێوازی یەکەم واتە: ئەگەر (عسى) لە ضە میرەکەدا عەمەل بکات، لەسەرەنجامدا (عسى) لەگەڵ ئیسمەکەی پێش خۆیدا هاوڕێکی و موتابیق بوون دەنوێنێت. وەك: (هِنْدٌ عستْ أن تقومَ)، (الزّيدان عسيا أن يقوما)، (الزّيدونَ عسيا أن يقوموا). بەڵام بەگوێرەی شێوازی دووەم کە (عسى) لە ضە میرەکەدا عەمەل نەکات وە بێ نیاز بێت لە خەبەر و پێویستی پێی نەبێت، ئەوا لە سەرجەم شێوازەکاندا (عسى) موفرەدە، واتە: لە ڕوی (مثنى)و (جمع) و (مذكّر) و (مؤنث) بونەوە، لەگەڵ ئیسمەکەی پێش خۆیدا هاوڕێك و موتابیق دەبێت.

وە ئەگەر فیعل پێشی ئیسم کەوت، ئەوا ئیحتیمالی دوو شێ هەیە: یان (تام)ە، واتە (أن يقوم) لە تەئویلی مەصدەردا فاعیلە. یان (نقص)ە، واتە: (خبر مقدم)ە، وەك: (عسى أن يقوم زيد) (حرى زيد أن يقوم) (اخلولق السماء أن تمطر). ئەم سیانە بۆ (رجاء) ئومێدەواری بەکاردێن.

الثاني: كاد و كرب وأوشك، نحو: أوشك زيد أن يقوم وكثر أن في أوشك وقلت في أخويه. والثالث: البواقي، نحو: وطفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة، وأنشأ أو جعل أو أخذ أو علق السائقُ يحدو، أي شرع فيه وليس معها أن، لأنها للحال، وأن للإستقبال ولم يستعمل غير الماضي من تلك الأفعال إلا يكاد ويوشك وموشك اسم فاعل. دووەم: (كاد وكرب و اوشك) . ئەمەیان بۆ (حصولا: بەدی هاتن) بەکاردێن، واتە بەدی هاتنی خەبەرەکە، بۆ ئیسمەکە نزیك دەکەنەوە، وەك: (أوشك زيد أن يقوم) لە خەبەری

(أوشك)ەدا ،(أن) زۆر بەکاردێت، بەڵام لە (کادو کرب)دا بۆ نەفی (أن) لەگەڵ خەبەرەکەیدا زۆر کەمە. سێیەم: (طفق، أنشأ، جعل، أخذ، علق)ەکە بۆ (أخذا فيه) واتە :دەست پێکردنی خەبەر بەکاردێن، وەك: (طفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة). (طفقا): أفعال المقاربة. (ألف): اسم (طفق). (يخصفان): خبر (طفق). واتە: ئادەم و حەوا دەستیان کرد بە لەبەرکردنی پۆشاکی ئەو شوێنە. 2-جعل السائق يحدوا، وشترەوانەکە دەستی کرد بە لاواندنەوە. 3- أخذ السائق يحدوا. 4- علق السائق يحدوا. هەموو ئەم فیعلانە بۆ دەست پێکردن بەکاردێن. وە ئەم فیعلانە (أن)ی ناصیبەیان لەگەڵ نایەت، چونکە بۆ زەمانی (حال) لێرەدا بەکاردێن، وە (أن) بۆ (استقبال: داهاتوو) بەکاردێت. وە لەم فیعلانە هەموو ماضی دەبن جگە لە (کاد، اوشك) کە موضاریعەکەیان (يكاد، يوشك)ە، و ئیسم فاعیلەکەی (موشك)ە.

## النوع التاسع

أفعال تسمى أفعال المدح والذم ويكون بعدها اسمان مرفوعان أحدهما الفاعل والآخر المخصوص بأحدهما، وهي أربعة: نعم وحبذا للمدح وبئس وساء للذم وفاعلها أما معرف باللام نحو: نعم الرجل زيد، أو مضاف إليه نحو: نعم غلام الرجل زيد، أو مضمر مبهم مميز بنكرة منصوبة، نحو: نعم رجلا زيد، أو بما، نحو فنعمّا هي، ومخصوصها أما مبتدأ وما قبله الخبر، أو خبر لمبتدأ محذوف وهو:"هو" أو"هي". جۆری نۆیەم: چەند فیعلێکن بە (أفعال المدح والذم) ناو دەبرێن، وە لە دوایانەوە دوو ئیسمی مەرفوع دێن، یەکێك لە دوو ئیسمەکە دەبێتە فاعیل بۆ ئەم فیعلانەو دووەمیان دەبێتە (مخصوص، تایبەت) بە "مدح "یان "ذم"ەکە، وە ئەم فیعلانە چوارن: (نعم، حبذا) بۆ ستایش کردن،

*فیعل دوو بەشە: 1-یان لەڕودانی کارێك لەزەمانی داهاتوودا یان ڕابردوودا هەواڵ دەدات، وەك: (یضربُ - ضرب) وە لەم بەشەدا بە دیهاتنی ماناکە، تەنها بە لەفزی فیعلەکە نایەتە دی. 2-وە یان بەدیهاتنی و دروست بونی ماناکە دێتە دی، وە بەبێ لەفزی فیعلەکەیش، مەعناکەی نایەتە دی و حاصڵ نابێت، وەك: (بعتُ و أنكحتُ) وە یان. (نعم الرجل زيدٌ) بە گۆڕینی لەفزە کە مەدحە کە دێتە دی، جا لە واقیعدا دەتوانرێت بوترێت، لەفزەکە بەدیهێنەری ماناکەیە.

و (بئس، ساء) بۆ سەرزەنشت کردن بەکاردێن. بزانە فاعیلی ئەم فیعلانە لە چوار شت بەدەر نین، لێرەدا: 1-یان فاعیل (معرف باللام) واتە (الف ولام)ی پێوەیە، واتە (علم) نی یە، بەڵکو (اسم جنس)ە، کە بەهۆی (الـ)ەوە بووەتە مەعریفە، وەك: (نعم الرجل زيد) (الرجل): فاعل.ـــلـ (نعم)

و (زيد) مخصوص بمدح. 2–يان فاعيل موضافه بۆ لای ئیسمێکی( معرف "به" ألف و لام)، وەك: (نعم غلام الرجل زيد) كه (غلام) نەكیرەیە،و ئیضافه كرا بۆ لای (الرجل) و فاعیله بۆ (نعم)ە. 3–یان فاعیل ضه میرێکی نادیار (مبهم)ە، وه تەنها به هۆی ئیسمێکی نەكیرەوە مەنصوبی تەمییزەكەی كراوە، وه ئیشی تەمیز ئەوەیه كه ضه میره موبهەمەكه ڕۆشن دەكاتەوە، وەك: (نعم رجلا زيد) كه له (نعم)دا (هو) ضه میرێکی (مبهم، نادیار)ە، وه (رجلا): تەمیزەو نەكیرەیەو مەنصوبه كه ئەم (رجلا) ئەو ضه میرەی ڕۆشن كردەوە.

4–یان فاعیل ضه میرێكه به هۆی (ما)وه دەربڕاوە، وەك (فنعما هی) كه له لەصلّدا (نعم) بووه (ما) ئیسمه. وه بزانه مەخصوص به مەدح یان زەم دەبێته دوو شت: 1–(زيد) :موبتەدایه، و (نعم الرجل) خەبەری موقەددەمه. 2–یان (زيد) خەبەرە، بۆ موبتەدایەكی مەحزوف، وه ئەگەر ئەمە تایبەت بوو به (مؤنث): (هِيَ) تەقدیر بكرێت، وەك (نعمت المرأة هند، أي: هی هند). وه (هو) تەقدیر بكرێت، وەك: (نعم الرجل زيد)، (أي: هو زيد).

و إبهام الضمير إنما هو على الثاني، دون الأول، وساء وبئس مثلها، وقد يحذف المخصوص، نحو: فنعم العبد، أي (أيوب)عليه السلام ، وحبذا، نحو: حبذا الرجل زيد، فحب فعل ماض. وذا فاعله والرجل صفة للفاعل، وقد يحذف الصفة، ويأتي بتمييز أو حال قبل المخصوص، أو بعده مطابقا له في الإفراد والتذكير، وغيرهما، نحو: حبذا رجلا أو راكبا زيد وحبذا زيد رجلا أو راكبا وحبذا رجلين أو راكبين الزيدان وحبذا الزيدان رجلين أو راكبين وهكذا في البواقي. له شوێنێكدا كه ضه میری موبهەم فاعیلی (نعم) بوو، ئەم ئیبهامه. ئیعرابی دووەمی بۆ دروسته، نەك ئیعرابی یەكەم، واته ئەو شوێنەی كه (مەخصوص به مەدح

خەبەر بێت. بۆ موبتەدایەکی مەحزوف، دەتوانرێ ضە میرە موبهەمەکە، فاعیل بێت، بۆ ئەو فیعلانە، چونکە مەخصوص بە مەدح و موبتەدا مەحزوفەکەی ڕستەیەکی سەربەخۆن، وە "نعم"ە و فاعیلەکەی ڕستەیەکی سەربەخۆن، لەو کاتەدا دروستە ضە میر لە (نعم)دا، موبهەم بێت، بەڵام ئەگەر : "(نعم الرجل) :خبر مقدم و (زید) :مبتدأ مؤخر"

بێت، ئەوا ضە میر لە (نعم)دا، موبهەم نابێت، چونکە لەم کاتەدا، ضە میر بۆ موبتەدا دەگەڕێتەوە، بۆیە ڕستەی موبتەدا و خەبەر پێویستیان بە (عائد — گێڕەرەوە)یەك هەیە، کە (هُوَ)یە، کە لەژێر (نعم)ەدایە، جا لەم کاتەدا موبهەم بوونی ضە میر دروست نی یەو بێ مانایە. وە (ساء و بئس) وەك ئەو دوانەکەی تر وان، وە ئەو قاعیدانەیان بەسەردا جێگیر دەبێت، پێویستە بزانرێت کە (تاء) لە هەندێ جێگادا لە (أخبار: هەواڵ) دا دیسان، بەکاردێت، وەك: (سائني هذا الأمر: ئەم کارە منی ناڕەحەت کردووە). وە هەندێ جار مەخصوص بە مەدح یان زەم حەزف دەبێت، بە هۆی بوونی نیشانەیەك، وەك (نعم العبد) واتە :(أیوب) کە مەخصوص بە مەدحە. وە (حبذا) وەك (حبذا الرجل زید) کە: (حب): فعلی ماضی یە (ذا) :فاعیلە. (الرجل): صیفەتە بۆ (ذا) کە فاعیلە. وە هەندێ جار صیفەت حەزف دەبێت، وە پێش مەخصوص بە مەدحەکە، (تمیز یان حال) دێت یان دوای مەخصوص بە مەدح (تمیز یان حال) دێن، کە هاوڕێکن لەگەڵ مەخصوص بە مەدحەکەدا، لە (مفرد و مذکر، یان مؤنث، وجمع مؤنث)ی دا، وەك ئەم نموونانە: 1–حبذا رجلا زید: (رجلا) تەمیزەو پێش مەخصوص کە (زید)ە کەوتووە. 2–حبذا راکبا زید. (راکبا) حاڵە و پێش (زید) کەوت. 3–حبذا

زيد رجلا.( رجلا )تەميزە و دوا كەوت. 4–حبذا زيد راكبا. (راكبا) حاڵە و دوا كەوت. 5–حبذا رجلين الزيدان. (رجلين) تەميزە و پێش كەوت. 6–حبذا راكبين الزيدان. 7–حبذا الزيدان رجلين. 8–حبذا الزيدان راكبين. كە لە (5، 6، 7، 8)دا ،تەميزو حاڵ هاوڕێكن لەگەڵ مەخصوص بە مەدحدا.

وە دەتوانيت نموونەی تر هەر بەم شێوازە پێ بكەيت: وەك: 1–حبذا امرأة هند: هاوڕێكی لە ڕووی "تأنيث" ەوە.

2 حبذا راكبا هند. 3–حبذا هند امرأة. 4–حبذا هند راكبا. 5–حبذا امرأتين الهندان. 6 حبذا الراكبين الهندان.

## النوع العاشر

**أفعال تسمى أفعال القلوب، وأفعال الشك واليقين، تدخل على المبتدأ والخبر وتنصبهما على المفعولية، وهي علمت، ورأيت ووجدت لليقين، وحسبت وخلت وظننت للشك ، وزعمت لهذا تارة ولذاك تارة أخرى، نحو علمت زيد فاضلا، وحسبت بكرا كريما، وزعمت بشرا أخاك وهكذا ساير تصاريفها، ولا يجوز الإختصار على أحد معموليها ويجوز حذفهما معا، نحو: من يسمع يخل أي يخل مسموعه صادقا.جۆرى دەیەم: چەند فیعلێکن بە** (أفعال القلوب) **ناو دەبرێن، *هۆی ناونانی ئەم فیعلانە بە "أفعال القلوب" ئەوەیە کە ئەم فیعلانە لەکاتی کردنیاندا و ئەنجام دانیاندا پێویستیان بە پەل و پۆو ئەندامە ظاهری یەکانی مرۆڤ نی یە، بەڵکو فیعل گەلێکن کە بەهۆی هێزی ناوەکی و زیهنی یەوە دەکرێن، و دێنە ئەنجام دان، کە بەم جۆرە فیعلانە (گومانی)یش دەگۆڕێت. یاخود ئەفعالی** (شك ويقين) **دەچنە سەر موبتەدا وخەبەر و دەیانکەنە مەفعول بۆ خۆیان، ومەنصوبیان دەکەن،** (بناء) **لەسەر ئەوەی کە مەفعولن، وە ئەم فیعلانە ئەمانەن: (علمت، رأيت، وجدت) کە بۆ یەقینن، وە (حسبت، خلت،** ظننت**) بۆ** (شك)**ن، وە (زعمت) :**(لهذا تارة) **واتە: بۆ (شك) بەکار دێت، وە** (لذاك تارة أخرى) **وە بۆ یەقینیش بەکاردێت، وەك:**

1-علمت زيدا فاضلا. *** لەبەر ئەوەی کە دوو مەعمولەکەی (أفعال القلوب) لە ئەصڵدا موبتەدا و خەبەربوون، و پەیوەستن بە یەکترەوە بۆیە هێنانی یەکێکیان بە بێ ئەوی تریان. دروست نی یە.** 2-حسبت بكرا كريما.

3- زعمت بشرا أخاك.

وە (تصاریف:گۆڕانکاری)یەکانی تری ئەم فیعلانە هەر،دوو مەفعولیان پێویستە. وە دروست نی یە حەزف کردنی یەکێك لەو دوو مەفعولەی فیعلەکانی "قلوب"، بەڵکو هەردووکیان حەزف دەکرێن، وە: (من یسمع یخل) ئەوەی کە دەبیستێ خەیاڵ دەکات، کە ئەوەی بیستوویەتی ڕاستە، واتە (یخل مسموعه صادق) کە (مسموعه) مەفعولی یەکەم (صادقا) مەفعولی دووەمەو حەزف بوون.

تنبیه: وألحق بها أفعال آخر كأعطى وكسى وسمّى، نحو: أعطيت زيدا درهما، وكسوته جبة، وسميته خليلا. وأفعال التصيير، كصيَّر وجعل وردَّ وترك واتخذ، وما يتصرف منها، نحو: واتخذ الله إبراهيم خليلا، وكذا أحوال البواقي.
ئاگاداری: پاشکۆی ئەفعالی (قلوب) ئەمانەن: 1-"أعطى"، وەك: (أعطيت زيدا درهما). (زیدا) مەفعولی یەکەم. (درهما) مەفعولی دووەم. 2-"كسى"، وەك: (كسوته جبة). 3-"سمى": وەك: (سميته خليلا). وە جگە لەمانە ئەفعالی (تصيير) واتە گۆڕان لە حاڵەتێکەوە بۆحاڵەتێکی تر، پاشکۆن. وەك: (صيَّر، ردَّ، ترك، اتخذ) وە ئەوەی لەمانەوە دروست دەکرێت. وەك: (واتخذ الله إبراهيم خليلا) کە لێرەدا: (اتخذ) بە مانای (صيَّر) هاتووە. (الله) فاعیلەو (إبراهیم) مەفعولی یەکەمەو (خلیلا) مەفعولی دووەمە. وە ئەفعالی (تصيِّر) ئەوانی تریشیان هەر بەم شێوازەن، وەك: (فجعناه هباء منثورا).

*تێبینی:ئەم پاشکۆیانە، (أفعال القلوب)نین، بەڵام موبتەداو خەبەرمەنصوب دەکە،ن وە ئەمانەن.
1- اَعطى: أَعْطَيْتُ زَيْداً دِرْهَماً. 2- كَسى: كَسَوْتهُ جُبَّةً. 3- سَمّى: سَمَّيْتُهُ خَليلاً.

4- صَبَّرَ: صَبَّرْتهُ ذاهِباً. 5- جَعَلَ: جَعَل النَّهارَ متعاشا. 6- رَدَّ: رِدَدْتهُ سالِماً.

7- تَرِكَ: تَرَكْتُهُ فَرْداً.

8- اَتَّخَذَ: اَتَّخَذَ اللهُ ابراهيمَ خَليلاً.

وه لهم چوارچێوهیهشدا ئهوانهی که لهم فیعلانه وهردهگیرێت، ههروهك خودی (أفعال القلوب)كار دهكهن.

## النوع الحادي عشر

أسماء تسمى أسماء الأفعال، وهي أنواع، منها ما يرفع على الفاعلية فقط، ومنها ما ينصب على المفعولية أيضا، ومنها ما يستعمل على الوجهين أما الأول:فعلى ضربين، واحدهما ما يعمل في الضمير، ومنه أمين بمعنى استجب، وهيت بمعنى اسرع ، وفي التنزيل هيت لك، وقط بمعنى انته، مثل: أعطيته درهما فقط، وفائه جزائية والشرط محذوف، أي إذا أعطيته درهما فقط، وأف بمعنى التضجّر، نحو:ولا تقل لهما أف، و وَيْ و واها و آها بمعنى أتعجب، نحو: ويكأنه لا يفلح الكافرون، و واها لك ثم آها، وثانيهما ما يعمل في المظهر ومنه هيهات: نحو هيهات الأمر، أي: بعد.جۆری یازدەهەم: چەند ئیسمێکن بە (اسماء الأفعال) ناو دەبرێن، *(اسماءالأفعال) ئەو وشانەن، کە لە ڕووی عەمەلو ماناوە، لە جێگای فیعل دادەنیشن، وە هەر یەکە بە هاوڕێکی ماناکەی خۆی وەك فیعل عەمەلێکی هەیە، واتە: ئەگەر فیعلەکە لازم بێت، تەنها فاعیل و ئەگەر موتەعەددیش بێت بە مەفعول بە،یەوە، ڕازی دەبێت، وە مەبەست لە بەکار هێنانیان لە جێگای فیعل دا، کورت بڕی، وشت لە خۆ گرتن(تَضَمُّن)و موبالەغە تیادا کردنیانە. وە (أسماءالأفعال) چەند جۆرێکن، هەندێکیان (بناء) لەسەر فاعیلیەت ڕەفعە دەدەن، هەندێکیان (بناء) لەسەر مەفعولیەت نەصبە دەدەن، وە هەندێکیان بە ڕەفعەو بە نەصبە کار دەکەن. *(ڕەفع کەرەکان دوو جۆرن): یەکەمیان: ئەوەیە کە کار لەسەر (ضمیر) دەکات و (ضمیر) دەبێتە فاعیل بۆی. وەك (آمین) کە (اسم فعل)ە، واتە (وەلآمان بدەرەوە). (هیت): ئیسم فیعلەو واتە: (خێرابە).

*دەربارەی(هَیْتَ)چەند شێوازێك هێنراوە، ئەهلی مەدینەو شام (هِیتَ) بەکەسری هاء و فەتحەی تاء دەخوێننەوە، و ئیبن کە ثیر،( هَیتُ) بە فەتحی هاء و ضە ممی تاء دەخوێنێتەوە، و ئەوانی تریش (هَیتَ)ە یان، بە فەتحەی هاء و تاء خوێندوەتەوە وە لە (أمام عاي و أبي رجاء و أبو وائل و يحيى بن وهاب)ەوە نەقڵ کراوە کە (هِئْتُ)بەهەمزەو ضە ممی(تاء)ەوە، خوێنراوەتەوە، وە هەر ئەم خوێندنەوەیەش بەکەمێ: جیاوازیەوە لە (أبن عبّاس و عِكرمة .و مجاهدو قتادة)ەوە گێڕدراوەتەوە. وە لە خوێندنەوەیەکی تردا کە لە ئیبن عەبباسە وە نەقڵ کراوە (هَیتِ)بە فەتحەی هاء کەسرەی(تاء)ە، وە ئەم خوێندنەوەیەش لە (أبو الأسود)و(أبن أبي أسحاق)و(أبن محيصن)، (عيسى الثقفي)یەوە گێڕدراوەتەوە.

وە خوێندنەوەی سێیەمیش کە لە ئیبن عەبباسەوە وەر گیراوە، (هیت لك) لەسەر شێوەی فیعلی ماضی‌یە، وە دەربارەی دروستی و ساغی ئەم خوێندنەوانە (زجّاج)گوتویەتی: لە (هیت لك)دا چەند لوغەیەك هەیە، کە باشترینیان (هَیْتَ لك) بە فەتحی هاء و (تاء)ە چونکە ئەمە خوێندنەوەی مەشهورە، وە مانای ( هَیْتَ: واتە: وەرە و نزیك ببەرەوە)، جا هەر جۆرێك بێت، ئەمە ئیسم فیعلە، و حەرەکەی کۆتاییەکەیش لەبەر خاتری(ألتقاء ساكنين)ە ،کەوایە.

(قط) واتە کۆتایی پێ بێنە، وەك" أعطيته درهما قط"، واتە:" درهەمێکم پێدا، و ئەم درهەمە بە بەس (کاف) بزانە". واتە: بە درهەمێك ڕازی بەو بێ دەنگ بە. (فاء)ی (فقط) جەزائیەیە، واتە (جزاء)ە بۆ شەرتێکی مەحذوف، کە ئەصڵەکەی (إذا أعطيته درهما فقط) .کە ئەم (فاء)ە، جوابی (إذا)یە. وە (أف) بە واتای (سەخت گیریی) دێت، وەك (ولا تقل لهما أف) واتە: شتێکیان بەرامبەر مەڵێ کە سەخت گیر بێت و پێی دڵ شکاو بن. (وی، واها،

وأها) به ماناى (سەرسوڕمان) دێن، وەك: (ويكأنه لا يفلح الكافرون) سەرم سوڕ دەمێنێ كە كافران سەرناكەون. (فراء) كە يەكێكە لە زانایانی نەحو ئەڵێ: ئەصڵی (ويكأن) (ويلك) بووەو (لام)ەکەی حەذف بووە. وە (واها لك ثم أها) سەرم لێت سوڕ دەمێنێ و دیسانەوە سەرم لێت سوڕ دەمێنێ.

بەشی دووەم لە (أسماء الأفعال) ئەوانەن كە عەمەل دەكەنە سەر ئیسمی ظاهر، وەك (هيهات الأمر) (هيهات): واتە دووركەوتەوە. كە (الأمر) فاعيلی (هيهات)ەو ئیسمی ظاهرە. وشتان، نحو شتان زيد وعمرو، أي افترقا، تقول شعان ما بين زيد وعمرو وشتان ما بينهما. وسرعان: نحو سرعان زيد، أي سرع، وفي المثل سرعان ذا أهالة. وأما الثاني فكلمات منها: رويد ، نحو: رويد زيدا، أي امهله، و رويدا في أمهلهم رويدا، مصدر وفي قولهم ساروا رويدا، أما حال: أي ساروا مرودين، أو نعت لمصدر تقديرا كما في ساروا سيرا رويدا لفظا. (شتان) وەك (شتان زيد وعمرو) واتە: جيا بوونەوە، واتە نێوانی زەيد وعەمر جيايی تيايدا ڕووی دا.

"ڕونكردنەوە"

يەكێك لە جۆرەكانی(توابع) بريتی يە لە (عطف بالحروف)كە لە نێوان دوو وشە دا، يان لە نێوان دوو دەستەواژەدا يان لە نێوان دوو جوملەی وادا كە لە ڕووی ناوو نيشانی نەحوی يەوە لێك چون و موشابەهەت لە نێوانياندا هەبێت، قوت دەبێتەوە.و پێويستە بزانرێت كە مەعطوف،لە حوكمی مەعطوف عليە،دايە، بەم مانايە كە هەر حوكمێك كە بۆ مەعطوف عليە ، تەصەوور بكرێ، هەمان ئەو حوكمە لە مەعطوف ،صيفەت يان خەبەر يانْ صيلە،يان حالْ بێت، ئەوا مەعطوف عليە، يش ديسانەوە ئەم تايبەت مەنديانەی هەيە. وە ياساو پێودانگی

گشتیی بۆ مەعطوف ،ومەعطوف علیە، ئەوەیە کە مەعطوف ،بتوانێت، لە جێی مەعطوف علیە ، دابنیشێت، وە لە ڕووی حوکمیشەوە مەعطوف ،وەك: مەعطوف علیە ،وابێت، وە ئەگەر مەعطوف ، نەتوانێت، لە جێی مەعطوف علیە ،دابنیشێت، لە ئەنجامدا لە ڕووی حوکمەوە لەگەڵ یەکتریدا یەکسان نابن، بۆ وێنە: (مازَیْدُ ضارِبُ وَلا ذاهِبُ عَمْرُوُ)جا (ذاهِبُ)ناتوانێت کە مەعطوف ، بێت.

لەسەر (ضارِبُ)چونکە .(ضارِبُ) هەڵگری ضە میرێکە کە مەرجەکەی (ئەو جێگایەی کە ضە میرەکەی بۆ دەگەڕێتەوە)، (زَیْدَ)ە ،بەڵام(ذاهِبُ)هەڵگری ضە میر نیەو ڕەفع کەری ئیسمە ظاهیرەکەیشە.

(سرعان) واتە :(سەریعی)، (زید): فاعیلی (سرعان)ەیە، وەك (سرعان ذا أهالة). بەشی دووەم: ئەوانەن کە (بناء) لەسەر مەفعولیەت، نەصبە دەکەن، وەك (روید زیدا) واتە: (وازی لـێ بێنە)، کە (زیدا)ی مەنصوب کردووە، وە مەفعولیەتی ، بەڵام (رویدا) لە (أمهلهم رویدا)دا (أمهل): فیعلی ئەمرە. (هم): مەفعول. (رویدا): مەصدەرە. واتە :(مفعول مطلق)ە، بۆ (أمهل). وە لە (ساروا رویدا)دا (رویدا): حالە، چونە ئەصڵەکەی (ساروا مرودین). کە (مرودین) ئیسم فاعیلە. یاخود (نعت: صفەت)ە، چونکە (ساروا سیرا رویدا) کە (رویدا) صیفەتە بۆ (سیرا) کە لە لەفزداباس کراوەو دەربڕراوە. وعلیك، نحو: "علیك زیدا"، أي "ألزمه" وفي الحدیث : "علیك بصلاة اللیل"، و"بله": نحو: "بله زیدا"، أي "دعه". وفي قولهم: "بله زید" مصدر مضاف. و "دونك" نحو: "دونك زیدا" أي "خذه".و"أمامك": نحو" أمامك زیدا"، أي" تقدمه".و"حیهلَ": نحو: "حیهل الثرید"، أي "ایته".و"ها" نحو:" ها زیداً" أي "خذه" وفي التنزیل:" هاؤم اقرأوا کتابیة". (علیك) واتە: پێوەی پابەند بە.

وەك: (عليك بصلاة الليل) بە شەو نوێژەوە پابەند بە. (بلە) واتە: واز بێنە (بلە زيدا) واز بێنە لە زەيد. وە لە ڕستەی (بلە زيد)دا، (بلە)مەصدەرەو موضاف كراوە بۆ لای زەيد. (دونك): واتە بيگرە وەك : "دونك زيدا": زەيد بگرە. (أمامك) واتە پێشی بخە. (زەيد پێشی خۆت بخە). (حيهل) واتە: وەرە، وەك: (وەرە تريت بخۆ). (ها): واتە بيگرە، (هاؤم اقرأوا كتابية) كتێبەكانتان بخوێننەوە.
*"ها": اسم فعل. "أنتم": فاعل. " اقرأوا": فعل أمر. "و": فاعل. "كتاب": مفعول به وهو مضاف. "ي": مضاف إليه. (هاء): سكت.

*(ها: بگرە): وەك: ( ها دِرْهَماً: أيّ: خُذْهُ) درهەمەكەی بگرە. وە لە (مثنى و جمع مؤنث)دا دەوترێت (هاؤما)،(هاؤم)،(هاء)، (هاؤُما)،(هاؤونَّ)،، وەك: (هاؤُ) أقْرَؤا كِتابيهْ)و لە موفرەدی مؤنث و جەمع مؤنث دا دەگوترێت: (هاءيا أمْرَئَة)و ( هاؤُنَّ يا نِسْوَة)و هەمزە لە (هاء)دا، لە جێگای كافی (خطاب)دايە، وە ئەم هەمزەيە جاری وا هەيە، حەزف دەكرێتن وە لە جياتی شتە حەزف كراوەكە، كافی (خطاب)ی پێوە دەلكێت، وە شەش صيغەكەی بەم جۆرەيە : (هاكَ:هاكُما: هاكُمْ: هاكِ: هاكُما: هاكُنَّ). وأما الثالث: فنحو: هلم جرا، اي تعال، تجر جرا، وهلم شهداءكم أي هاتوهم، ومنها فعال كنزال. بمعنى انزل، وتراك الأمر أي أتركه. وهذه الأسماء أما لازم التعريف كنزال وبله وامين أو التنكير، نحو: أها، وواها، أو جائز الأمرين كصهٍ، وصَهْ ومهٍ،ومَهْ وأف وأف فما نوّن نكرة، وما عرى معرفة. سێيەم: ئەوانەی كە نەصبەو ڕەفعەش دەدەن، وەك: (هلم جرا) واتە: وەرە، بكێشە يەك جۆرە كێشان. كە لێرەدا (تجر) حەذف كرابوو، بۆيە (جرا) مەفعول موتلەقی (تجر)ەيە، وەك: (هلم شهداءكم) واتە شەهيدەكانتان ئامادە بكەن. لێرەدا: (هلم) :(شهداءكم)ی مەنصوب كردووە. وە ئەو ئيسم فيعلانەی كە نەصبەو

ڕەفعە دەکەن، وەك: (نزال) کە لەسەر وەزنی (أنزل)ە: کە فیعلی ئەمرە. (تراك) واتە (تەرك بکە)، کە (الامر) مەفعولی (تراك)ە. جا بزانە (أسماء الأفعال) سێ بەشن: 1-یان مەعریفەن، وەك (نزال، بله، وامین) کە ئەمانە نابنە نەکیرە، بەڵکو بەردەوام مەعریفەن. 2-یا نەکیرەن، وە نابنە مەعریفە، وەك (أها، واها). 3-یان هەم نەکیرەن و هەم مەعریفەن، وەك (صه، مه، أف) کە (تنوین) یان چویە سەر وەك (صهٍ، مهٍ، أفٍ) نەکیرەن، کە ساکن بوون وەك: (صَهْ، مَهْ، أفْ) مەعریفەن. *(نوّن): کە لە مەتنەکەدا هاتووە، واتە: تەنوینیان چوویە سەر.

*(عری): واتە خاڵی لە تەنوین.

## النوع الثاني عشر

أسماء تجزم الفعل المضارع على معنى أن الشرط، وتسمى كلم المجازات، وهي: متى، وإذما، وحيثما، وأينماو أنى ومهما، وما و من وأي و كيفما وإذا ولا جزم في إذ وحيث إلا مع ما:فمتى وإذما للزمان، نحو متى تقم أقم، وإذما تقم أقم، واينما وحيثما للمكان، نحو: أينما تكن أكن، وحيثما تخرج أخرج، وأنى كاينما ومتى، نحو: أنى تقعد اقعد، وأنى تصم أصم، ومهما كمتى، نحو: مهما تسافر أسافر، قيل هي بسيطة وقيل مركبة أما من ما الشرطية، والزائدة، فقلبت الألف الأولى هاء تحرزاعن التكرار، أو من مه وما الشرطية كأنه قيل لك انت لا تفعل ما أفعل فقلت مهما تفعل أفعل. جۆری دوانزەهەم: چەند ئیسمێکن، جەزمە دەدەن بە فیعلی موضاریع. "ڕونکردنەوە"

فیعلی موضاریع: ئەو فیعلەیە کە شەباهەت و لێکچوونی لەگەڵ ئیسم دا هەیە، وە فیعلی موضاریع لەسەرەتایەوە یەکێك لە پیتەکان (أنيتُ) دێت، وەك: (يفعل–تفعل–أفعل–نفعل)، وە ئەم پیتانە بە (مضارعة) ناوزەد کراون، چونکە فیعل بە هۆی ئەم حەرفانەوە لەگەڵ ئیسم دا لێکچوون پەیدا دەکات، وە فیعلی موضاریع لەڕووی حەرەکات و سەکەناتەوە، هاو وەزنی ئیسمە، وە مەبەست لە هاو وەزن بوون، لە ڕووی ئیصتیلاحی (عروض)ەوەیە، وە لەزانستی (عروض)دا دوو کەلیمە لەکاتێکدا بەهاو وەزن دادەنرێن، کە لەڕووی حەرفەکان و حەرەکاتەکانەوە بەرابەریان هەبێت، واتە: ژمارەی حەرفەکان لەهەر دوکیاندا یەکسان بن، بۆ وێنە: (توتی) و (بُلبُل) لە ئیصتیلاحی زانستی (عروض)دا هاو وەزنن، چونکە: یەکەم: ژمارەی حەرفەکانی هەردوکیان یەکسانن. دووەم: حەرفی یەکەم و سێیەم لە هەردوکیاندا موتەحەڕیکن. جا هەر لەمەشەوە فیعلی

موضاریعی (یضربُ) لە ئیصتیلاحی زانستی (عروض)دا، لەگەڵ ئیسم فاعیلی (ضارب)دا هاو وەزنن. لەڕووەکانی تری لێکچوونی فیعلی موضاریع بە ئیسمەوە ئەوەیە کە لامی تەئکید (لامی ئیبتیدائیەت) بەسەرەتای فیعلی موضاریع و ئیسمەوە دەلکێت، وەك (إن زیداً لیقوم) هەروەك لە ئیسمیشدا (إن زیداً لقائمٌ) دەگوترێت. وە فیعلی موضاریع و ئیسم فاعیل لە ڕووی یەکسانی حەرفەکانەوە دیسانەوە وەك یەکن، وە هەربەم شێوازەیش فیعلی موضاریع و ئیسم لە ڕوی ماناوە هەردوکیان هاوبەشن لە نێوان (حال: ئێستا) و (مستقبل: داهاتوو)دا. هەڵبەتە هەندێکیش گوتویانە: حاڵ و داهاتوو هەردوکیان مانای حەقیقی یەکەی حاڵ و مانا مەجازی یەکەی بۆ موستەقبەلە. وە هەندێکیش ئەم لێکدانەوەیەیان بە بەهێز داناوە، چونکە فیعلی موضاریع هەرکات بەبێ نیشانە (مجرّد عن القرائن) بەکار هێنرا، ئەوا لەسەر (حال) حیساب دەکرێت، وە لە زەمانی (مستقبل)دا بەبێ نیشانە (قرینة) بەکار ناهێنرێت.

لەبەر ئەوەی کە لەسەر واتای (أن)ی شرطیە دامەزراون وبە (کلم المجازات) ناو دەبرێن، چونکە پێویستیان بە (جزاء) هەیە، کە ئەمانەن: (متی... کیفما، إذا)، وە بزانە (إذ، حیث) هەمیشە (ما)یان لەگەڵدایە، ئەگەر لەگەڵیاندا نەبوو، ئەوا جازمە نین، (متی، إذما) بۆ (زَمان: کات) بەکاردێن، وەك (متی تقم أقم: هەرکات هەستایت هەڵدەستم). *(إذما) ئەو ئەداتە شەرتەیە، کە دوو فیعل مەجزوم دەکات، وە لەلای (سیبویە) حەرفی شەرتە، وە لەلای (مبرّد) و (إبن السرّاج) و (فارسی) ظە رفە، وە هەندێکیش ڕایان وایە، کە عەمەلی (إذما) کە جەزم دانە بە دوو فیعل تەنها لەکاتی زەرورەتدایە. (أینما، حیثما) بۆ (مکان: شوێن) بەکاردێن، وەك:

(أينما تكن أكن: لە هەر شوێنێك دانیشتی دائەنیشم). (أنی) وەك: (أینما، متی) وایە، بۆ زە مان،و مەکانیش بەکاردێت، وەك: (أنی تقعد أقعد: لە هەرشوێنێ دانیشی دائەنیشم). بۆ زەمان وەك:( أنی تصم أصم: هەرکاتێ بە رۆژوو بیت منیش بە رۆژوو دەبم). (مهما) وەك (متی) وایە، بۆ زەمانە، وەك: (مهما تسافر أسافر). هەندێ دەڵێن (مهما) :(بسیط:سادە)یە، واتە هەر خۆی وابووە، و (مهما) بووەو مورەککەب نی یە، وە هەندێ دەڵێن (مهما) مورەککەبە لە (ما)ی شرطیە و (ما)ی زائیدە، کە ئەلفی (ما)ی یەکەم کرا بە (ها) لەبەر خۆپاراستن لە دووبارە بوونەوەی ئەلفەکە، چونکە ئەگەر نەگۆڕایە (ماما) دەبوو. یاخود (مهما) لە (مە) و (ما)ی شرطیە پێکهاتووە، کە (مە) واتە: واز بێنە، وەك ئەوەی کەسێ بڵێ (لا تفعل ما أفعل) ئەوەی من دەیکەم تۆ مەیکە، تۆیش لە وەڵامدا بڵێی (مهما تفعل أفعل) کە تۆ کردت منیش دەیکەم. ومن لذوي العقول، نحو: من تكرم أكرم، وما لغيرهم، نحو: ما تصنع أصنع، ومنه ما تفعلوا من خير يعلمه الله، وأيّ أعم، نحو: أيا تضرب أضرب وأيا ما تصنع أصنع، ولهذه الكلمات معان آخر لاتجزم بها، فمتى للإستفهام، نحو: متى تقوم، و متى القتال فيعم القبيلتين، وأين كذلك، نحو أين تكون، وأين زيد، و أنى للإستفهام، في المكان والحال، نحو: أنى زيد بمعنى أين هو وكيف هو، وبمعنى متى الإستفهامية، نحو أنى القتال ومن للإستفهام، نحو من أنت، ومهما لإستفهام الزمان، نحو مهما لي الليلة، وبمعنى ما، نحو مهما نذره من الهيئة المشروعة انعقد. (من) بۆ عاقڵ بەکاردێت، وەك (من تكرم أكرم). (ما) بۆ غەیرە عاقڵ بەکاردێت، وەك: (ما تصنع أصنع) یان (وما تفعلوا من خير يعلمه الله).

لەفزی (ما) لە قورئانی پیرۆزدا، بۆ شەش مانا بەکار هاتووە: یەکەم: (ما) بە مانای (نەء) هاتووە، وەك ئەم ئایەتە (أُوْلَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَ النَّارَ) ئەوانە بێجگە لە ئاگر شتی تر ناخەنە،... (نا)خەنە ،ناو زگیانەوە. البقرە/174.
دووەم: (ما) بە مانای (نی یە)یە، وەك ئەم ئایەتە: (وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ): وە بۆلای هۆزی سەمود برای ئەوان سالّحمان نارد،وتی: ئەی هۆزی من خوا بپەرستن کە بێجگە لەو بۆ ئێوە پەرستراوێکی -بەهەقی-تر نی یە، هود/61. سێیەم: (ما) بەمانای (ئەوەی کە) هاتووە: وەك ئەم ئایەتە (وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى): وە بەو زاتەی کە نێر و مێی خولقاندووە. اللیل/3. چوارەم: (ما) بەمانای (کام شت) هاتووە، وەك ئەم ئایەتە: (أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنْ بَعْدِي) یا لەسەرەمەرگی یەعقوبدا حازربوون و -دیتان- ئەو دەمەی وابە منالّەکانی خۆی ووت: دوای من چی ئەپەرستن. البقرە/133. پێنجەم: (ما) بەمانای (صلة)ەی، زیادە لە کەلامدا دێت، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە، (فبما رحمة من الله لنت لهم: لەبەر تیشکی ڕەحمەتی خوا بوو، کە بۆ ئەوان نەرم و دلّۆڤان بووی، آل عمران/159. شەشەم: (ما) بەمانای (هەروەك چۆن) هاتووە وەك ئەم ئایەتە: (فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ، خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتْ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ): جا ئەوانەی بێ بەخت بوون لە ئاگردان و ئەوانە لەوێدا هەناسە زۆر بەسەختی و توندی هەلّدەکشێن بەشێوەیەك کە دەنگێکی زۆر ناخۆشیان لێوە دەردەچێ، بۆ هەمیشە لەوێدا ئەمێننەوە تا ئاسمان و زەوی هەبن، هود(106/105).

(أى) بۆ عاقڵ و غەیرە عاقڵ بەکاردێت، وەك (أيا تضرب أضرب) بۆ عاقڵ. (أيا تصنع أصنع) بۆ غەیرە عاقڵ. ئەگەر ئەم (كلمات المجاز)انه بە غەیری ئەم مانایانە بێن، نابنە (كلم المجاز) وەك باس دەکرێ. (متى) بۆ (إستفهام)ە، وەك (متى تقوم) کەی دەوەستی؟کە لێرەدا جازمە نی یە، چونکە بە مانای (إستفهام) هاتووە. (متى): أداة إستفهام . مفعول مقدم. تقوم: فعل مضارع. بۆیە مەفعول پێش فیعل کەوتووە، چونکە (هل) دەبێت لەسەرەتای جوملەدا بێت، وە هەروەها جوملەی (متى القتال: کەی شەڕە)، (متى) خبر مقدم (القتال): مبتدأ مؤخر. (متى) بۆ عاقڵ و غەیرە عاقڵ دەبێت، کە لە نموونەی (متى تقوم) بۆ عاقڵە. (متى القتال) بۆ غەیرە عاقڵە. (أين): بۆ ئیستیفهامە، وەك: (أين تكون، أين زيد).

(أنى) بۆ ئیستیفهامە بە مانای مەکان دێت، بۆ هەواڵ پرسینی (حال)یش دەبێت، وەك: (أنى زيد) زەید لە کوێیە.

* لە قورئانی پیرۆزدا، لەفزی (أنّى) بەسێ شێواز بەکار هێنراوە. یەکەم: (أنّى) بەمانای (چۆن) هاتووە، وەك ئەم ئایەتە: (أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا)، خوا چۆن لە دوای مردن ئەمانە زیندوو دەکاتەوە، البقرة/ 259. دووەم: (أنّى) بەمانای (لە کوێوە) هاتووە، وەك ئەم ئایەتە: (أَنَّى لَكِ هَذَا) ئەی مەریەم ئەمەت لەکوێ بوو، آل عمران/37). سێیەم: (أنّى) بەمانای سەعات و کات و سات دێت، وەك ئەم ئایەتە: (آناء اللّيل وهُم يسجدون: شەوانە ئایەتەکانی خوا ئەخوێننەوەو سوجدە بۆ خوا ئەبەن. آل عمران/113). وە لە سورەتی (طه)دا دەفەرموێت: (ومِنْ آناءِ اللّيل: وە هەندێ لەکاتژمێرگەلی شەو، طه/130).

(أين هو): واتە: ئەو ئەحواڵی چۆنە.؟ وە بە مانای (متى)ی ئیستیفهامیە دێت، وەك: (أنى القتال) کەی شەڕە؟ (من) بۆ ئیستیفهامە، وەك: (من أنت) تۆ کێی؟

(مهما) بۆ ئیستیفهامی زەمانە، وەك: (مهما لي الليلة) ئەمشەو بۆ من چ شەوێکە؟ (مهما) بە مانای (ما)ی شرطيه دێت، وەك: (مهما نذره من الهيئة المشروعة انقعد: ئەگەر شتێك بکاتە نەزرو ئەو شتە دروست بێت کە بکرێتە نەزر، ئەوا ئەو کارە دروستە). کە لێرەدا (مهما) بە مانای (ما)ی شرطيه هاتووە. وما للإستفهام، نحو: ما هذا،وموصوفة، نحو: مررت بما معجب لك، وصفة، نحو: أضربه ضربا ما، وموصولة، نحو: فيه ما فيه، وتامة، نحو: ما أحسن زيدا، وأي مثل ما إلا في التام، ومن مثل أي إلا في الصفة، ومن وما، قد يتعاطيان المعنى فتكون ما لذوي العقول،نحو: والسماء وما بناها، ومن لغير ذوي العقول، نحو: ومنهم من يمشي على أربع، وأما الجزم بكيفما، وإذا فشاذ. (ما) بۆ ئیستیفهام دێت، وەك: (ما هذا). بە مەوصوفەیی دێت، وەك (مررت بما معجب لك) کە (معجب) صیفەتە بۆ (ما). وە بە (صفة)ی دێت، واتا (ما) صیفەت بێت، بۆ مەوصوفێك وەك: (أضربه ضربا ما) کە لێرەدا (ما) واتە (چ لێدانێ بە زەبر) کە (ما) صیفەتە بۆ (ضربا). وە بە مەوصولەیی دێت، وەك: (فيه ما فيه) کە (ما) بە واتای (الذي): مەوصولە هاتووە.

*(فيهِ ما فيهِ):ناوی کتێبێکی نایابی"جەلالەددینی ڕۆمی:بەلْخی یە"،داستان وگوتە فەلسەفە ئامێزەکانی ژیانی جەلالەددینە،بەڕاستی کتێبێکی زۆر دانسقەو گرنگە،خۆشبەختانە لە(2006)دا.(م.عەلی نانەوازادە)کردویەتیە کوردی ولە هەولێر چاپکراوە.

وە(ما) بە (تامة)یی دێت، واتە پێویستی بە صیفەت نەبێت، وەك: (ما أحسن زيدا) چۆن زەید چاك بکرێت. (ما): مبتدأ. (أحسن): فعل ماضي. وضميره

فاعل. (زيدا): مفعول. وه ئهم جوملهله مهحهللى نهصبدا خهبهره بۆ (ما) كه موبتهدايه.

* فيعلى تهعهجوب ئهو فيعلهيه كه لهسهر سورِمان و شتى ناعادهتى دا بهكار دههێنرێت، و دوو صيغهى ههيه، (ما أفعل) و (أُفعل به)، وهك: (ما أجمل السّماءَ! ئاسمان چهندهجوانه!)، (أكرم عليّ: عهلى چهنده گهورهو رێزداره!). له فيعلهكانى تهعهجوب ،دا ههميشه فاعيل وهك ضه مێرى موستهتير خۆى دهنوێنێت، وه مهفعولهكهيشى بهبێ (فاصيله) و لهدواى فيعلهكه راستهوخۆ دههێنرێت. وه لهگهر بمانهوێت، سهبارهت بهكارێك كه لهكاتى رِابردوودا رِووى داوه،سهرسورِمانى خۆمان دهربرِين، ئهوا له نێوان (ما)ى تهعهجوب و فيعلى تهعهجوب دا (كان) بهكار دههێنين، وهك: (ما كان أصعب ذاك الأمر!: ئهوكاره چهنده سهخت و ناخۆش بوو!)

(أى): وهك (ما) وايه، بۆ ئيستيفهاميه، مهوصوفه، صيفهت، مهوصوله دێت، بهس نابێته (تامة). (من): وهك (أى) وايه، دهبێته ئيستيفهاميه، مهوصوفه، مهوصوله بهس نابێته (صفة). (من، ما) لهههندێ كاتدا ماناى خۆيان به يهكترى دهبهخشن، بۆ نموونه: (ما) بۆ عاقلّه، (من) بۆ عاقلّه ديسانهوه، كهچى كه (ما) بۆ عاقلّه، وهك: (والسماء وما بناها) سوێند به ئاسمان و دروست كهرهكهى كه خوايه (عاقلّ ترينه لهههموو شتێ). كهچى (من) بۆ غهيره عاقلّ بهكاردێت، وهك (ومنهم من يمشي على أربع) كه لێرهدا بۆ ئاژهڵى غهيره عاقلّ هاتووه. وه.

به هۆى (كيفما) و (إذا)وه (جزم)دان زۆر كهمه.

. تنبيهان: الأول: كيف لإستفهام الحال، ويقع حالا وخبرا ومصدرا. نحو: كيف سرت راكبا أم راجلا. وكيف أنت، وكيف قرأت سرا أم جهرا. الثاني: إذا

للمضي، نحو: وإذا رأوا تجارة أو لهوا انفضوا إليها، وعاملها الجزاء، ويكون للحال بعد القسم، نحو: والليل إذا يغشى وهي مما يضاف إلى الجملة، ويكون للمفاجأة، فيقع بعدها المبتدأ والخبر، نحو: خرجت فإذا السبع بالباب فقيل زمان و قيل مكان وناصبها، معنى فاجأت المفهوم من الفحوى والتقدير خرجت ففاجأت مكان وقوف السبع أو زمانه. دوو ئاگاداری: یەکەم: (کیف)ە، بۆ پرسیار کردنە لە حاڵ، دەبێتە: حاڵ، خەبەر، مەصدەر. وەك:" كيف سرت راكبا أم راجلا؟". (كيف): محلا منصوب حال. (كيف أنت). كيف: خبر مقدم. أنت: مبتدأ مؤخر. (كيف قرأت سرا أم جهرا) کە ئەصڵەکەی (قرأت قرائة) بووە، (کیف) لە جێیدا بێت، بۆیە مەصدەرە.

دووەم: (إذا) بۆ رابردوو بەکاردێت، وەك: (إذا رأوا تجارة أو لهوا انفضوا إليها) کە (إذا) بۆ سەردەمی ڕابردوو هاتووە، واتە سەردەمی پێغەمبەر"صلى الله عليه وسلم".وە عاملی (إذا) دەبێتە (جزاء) کە لێرەدا (انفضوا)ە. بزانە لێرەدا (إذا) مفعول فيه.

## النوع الثالث عشر

أسماء تنصب أسماء النكرات على التمييزوهي أربعة: كم وكأين وكذا بمعنى العددوبعض العدد، فكم تكون أستفهامية وخبرية، والإستفهامية، تنصب بلا فصل ومعه، نحو: كم رجلا في الدار، وكم في الدار رجلا ومع حرف الجر تنصب وتجر، نحو بكم درهما أو درهم اشتريت وأما الخبرية وهي للتكثير فمع الفصل بالجملة تنصب وجوبا، نحو: كم نالني منهم فضلا، وبالظرف وشبهه على المختار، نحو: كم عندك أو في الدار رجلا، وبدونه تجر حملا على رب حمل النقيض على النقيض، أو النظير على النظير، نحو: كم رجل كريم لقيته.

جۆری سیازدەهەم. چەند ئیسمێکن کە ئیسمی نەکیرە بەناوی و بە هۆی تەمیزەوە مەنصوب دەکەن، وە چوار دانەن: (کم، کأین، کذا) ئەگەر بە مانای" عدد:ژمارە" هات،( بعض العدد: هەندێ لـە" عدد") تەمیزی مەنصوب هەڵدەگرن، چونکە هەندێکی تریان تەمیزی مەجرور،وەردەگرن. "تەمیزی دە تا سەد" مەنصوبەو تەمیزی (یەك تا دە) مەجرورن. (کم) دوو بەشە: 1- ئیستیفهامیە. 2-خەبەریە. (کم)ی ئیستیفهامیە، نەصبە دەدات بە ئیسمەکەی دوای، ئیتر نێوانەیان هەبێت یان نا...، وەك (کم رجلا فی الدار): (رجلا) مەنصوبە بە هۆی (کم)ەوە. (کم فی الدار رجلا) (رجلا) مەنصوبە بە هۆی (کم)ەوە، وە (وکم فی الدار رجلا) مەنصوبە بە هۆی (کم)ەوەو (فی الدار)یش نێوانەیانە. کە حەرفی جەرِ چوویە سەر (کم) هەم نەصب و هەم جەرِ دەدات. هۆی نەصب ئەوەیە کە (کم) ئیستیفهامیە، لە (أسماء نکرات)ەو نەصبە دەدات و هۆی مەجروری ئەوەیە کە (کم) ئیستیفهامیە موضاف بووە بۆ لای تەمییز. بزانە (کم) بە مانای (چەند زۆرێك) دێت و بۆ (تکثیر)ە.

ئەگەر لە نێوان (کم)ی خەبەریەو تەمیزەکەیدا جوملە هات، ئەوا پێویستە تەمیزەکەی مەنصوب بکات، وەك (کم نالني منهم فضلا): (فضلا) تەمیزە بۆ (کم). کە لەو نێوانەدا (نالني منهم) هاتووە. ئەگەر لە نێوان (کم و تمیز)دا ظە رف یان شبه ظە رف کە جار ومەجرورە هات، لەسەر ئەو قەولەی کە من هەڵم بژاردووە، واتە (ملا محسن) نەصبی تەمیز واجبە، وەك: (کم عندك رجلا) (رجلا): تمیز (کم). وە (عندك): ظە رفەو کەوتۆتە نێوانیان. وە ئەگەر لە نێوان (کم) و تەمیزدا نێوانە نەبوو، ئەوا تەمیزەکە مەجرور دەبێت. حمل النقیض علی النقیض: دوو شت کە لە تایبەتمەندیدا جیاوازن و لە زاتی ئەو شتەدا یەکن. یاخود لە زاتا جیاوازن و لە تایبەتمەندیدا یەکن، وەك (تەلەبە وەك مامۆستا) وایە. حمل النظیر علی النظیر: وەك ئەوە وایە، وەك ئەو پیاو چاکە، وەك ئەو پیاو چاکەیە، بۆیە (کم) حەمل دەکەنە سەر (رب) وەك (کم رجل کریم لقیتە). کە لە نێوان (کم و تمیز)ەکەیا نێوانە نی یە،بۆیە تەمیزەکە مەجرورە. وتمیم ینصبون بها ومميز الإستفهامية يفرد والخبرية يفرد ويجمع وقديجر بمن فيهما، نحو: كم من رجل ضربته، وكم من قرية اهلكناها، وقد يحذف نحو: كم مالك وكم ضربت، وكاين ، ككم الخبريه في التكثير، ودخول من على مميزها ويتصدروينصب غالبا، نحو: كأين رجلا عندي وكاين من قرية أهلكناها، وفيها خمس لغات كاين كاي بالكاف، وكاي كرأي وكاء كجاء وكيئ كشيئ وكاء كيد. وكذا المطلق العدد وتنصب غالبا، نحو: عندي كذا درهما وقد يجر الإسم بالإضافة نحو: عندي كذا درهم، وقد يرفع ما بعده على البدل، نحو: عندي كذا درهم، وقد تكون كناية عن غيرالعدد، نحو: خرجت يوم كذا، فهو مضاف إليه، وأما بعض العدد فهو من أحد عشر إلى تسعة وتسعين نحو: رأيت أحد عشر

كوكبا، وله تسع و تسعون نعجة. وه تەميمى يەكان دەڵێن: (كم) تەميز نەصبە دەكات، ئيتر نێوانە هەبێت يان نا....، ئەو نموونەيە بەم شێوەيە دەخوێننەوە (رب رجلا كريما لقيته). بزانە تەميزى (كم استفهاميه) هەميشە موفرەدە، وە تەميزى (كم)ى خەبەريە، هەم موفرەد و هەم جەمع دەبێت. وە تەميزى (كم)ى ئيستيفهاميه وخەبەريە هەردووك بە هۆى (من)ەوە،مەجرور دەبن. وەك: 1-كم من رجل ضربته. (من) پێش تەميزەكە كەوتووە. 2-كم من قرية أهلكناها. (من) پێش تەميزەكە كەوتووە. وە هەندێ جار تەميزى (كم)ى ئيستيفهاميەو خەبەريە حەذف دەبێت، وەك: (كم مالك؟): كە تەميزەكەى (دينارا) بووەو حەذف كراوە، ئيستيفهاميەيە. (كم ضربت؟) كە تەميزەكەى (رجلا) بووەو حەذف بووە، خەبەريەيە. (كأين) وەك (كم)ى خەبەريە وايە، چونكە: 1-بۆ (تكثير)ە، وەك: (كأين رجلا عندي) چەند پياوێكى زۆرمان لايە. 2-(مِن) دەچێتە سەر تەميزەكەى وەك: (كأين من قرية أهلكناها) وە (كأين) ،دەكەوێتە سەرەتاى كەلامەوە، بە زۆرى تەميز مەنصوب دەكات، وەك (كأين رجلا عندى) وە تەميز مەجرور دەكات، كاتێ كە (من) چوويە سەر تەميزەكەى وەك (كأين من قريه أهلكناها). (كأين) بە پێنج لوغەت دەخوێنرێتەوە: 1-"كأين". 2-"كأي" لەگەڵ كافدا. 3-"كأي" لەسەر وەزنى (رأى). 4- "كاء" لەسەر وەزنى (جاء). 5-"كيئ" لەسەر وەزنى "كشيئ".6-"كاء" لەسەر وەزنى (يد)، بۆيە شەش دەكات، چونكە يەكەم (كأين) مەشهورەو حيسابى بۆ نەكردووە.

"كذا"، بۆ ژمارەيەك بەكاردێت كە ديارى نەكراو بێت بە گشتى و تەميزەكەى مەنصوبە، وەك: (عندي كذا درهما) درهما: كە مە نصوبە.

وه له كاتى ئيضافه‌دا مه‌جرور ده‌بێت، وه‌ك: (عندي كذا درهم) كه (كذا) ئيضافه يه بۆ لاى (درهم). *بۆى هه‌يه (كذا) كه له‌گه‌ڵ (واو)دا دووباره ببێته‌وه، وه‌ك: (جائني كذا و كذا رجُلاً) وه بۆ ئاماژه‌دان له ڕسته (كناية عن الجملة) له‌نێوان دوو له‌فزى (كَيْت كيتَ) به دوباره‌كراوى ديسانه‌وه به‌كار ده‌هێنرێت: وه‌ك: (قال فلانٌ كيتَ كيتَ و فعل ذيتَ ذَيتَ).

وه هه‌ندێ جار ته‌ميزه‌كه‌ى مه‌ڕفوع ده‌بێت، (بناء) له‌سه‌ر ئه‌وه‌ى كه (بدل)ه. نحو: "عندي كذا درهم". (درهم): بدل، (عندي): خبر مقدم. (كذا): مبتدأ مؤخر. وه هه‌ندێ جار (كذا) بۆ غه‌يرى ژماره به‌كاردێت، وه‌ك: (خرجت يوم كذا). فلانه ڕۆژ چوومه ده‌رێ. كه لێره‌دا (كذا): محلا مجرور مضاف إليه. وه هه‌ندێ له ژماره ئيسمى نه‌كيره مه‌نصوب ده‌كه‌ن، (بناء) له‌سه‌ر ته‌ميزى، ئه‌وانه له (11) تا (99)ن وه‌ك: (رأيت أحد عشر كوكبا) (كوكبا): ته‌ميزه بۆ (أحد عشر). (وله تسع و تسعون نعجة) (نعجة): ته‌ميزه بۆ (99).

تنبيه: إذا أردت التنصيص على كمية شئ فتقول رجل ورجلان مثلا ثم تأتي بالعددو ما يميزه على ما نظمت:

ثمانا بعد ما جاوزت الأثنين بمجموع ومجرور فميز

عدا ما كان منها قد أضيفت إلى مأة بفرد فهو ميز

وفيما بعد عشر فردا أنصب إلى تسع وتسعين المميز

ولما جاز من تسع وتسعين فجر عند ذا فردا تُميز. ئاگادارى: كاتێ كه ده‌ته‌وێت ئه‌ندازه‌ى شتێك بلێيت، بۆ نموونه (رجل) يان (رجلان) واته

پیاوو دوو پیاو تەمیزی ناوێت، لەم کاتەدا کە لەمە تێپەڕی کرد، ژمارەکە دەهێنیت و تەمیزی بۆ دادەنێیت، وەك لەم شیعرانەدا ڕوونم کردۆتەوە: ثمانا بعد ما جاوزت الأثنين بمجموع ومجرور فميزواته هەشت دوای ئەوەی کە لە یەك و دوو تێپەڕی، واتە لە دوای ئەوەی کە تەمیزی یەك و دووت زانی لە سێ تا دە کە هەشت ژمارەن، تەمیزەکەیان جەمع ومەجرور بکە وەك: (عندي ثلاثة رجال). عدا ما كان منها قد أضيفت إلى مأة بفرد فهو میزجگە لەو ژمارانەی کە بۆ لای (مأة) ئیضافە کراون، لەوێدا تەمیز بە موفرەدی بێنە، وەك: (ثلاثمأة) کە (مأة) موفرە دە، و تە میزە. وفيما بعد عشر فردا أنصب إلى تسع وتسعين المميزلە دوای (10) موفرەدەکە مەنصوب بکە، تا (99)، واتە تەمیزی (11- 99) موفرەد و مەنصوب بکە. ولما جاز من تسع وتسعين فجر عند ذا فردا تميزكە لە (99) تێپەڕیت، پێویستە مەجرور بێت، لە لای کەسێ کە تەمیزەکە موفرەد بکات، واتە تەمیزی (100) بەرەو ژوور دەبێت موفرەدو مەجرور بێت، وەك: (مأة رجل، مأتا رجل، ثلاثمأة رجل)، تا( تسعمأة رجل)، و(ألف رجل) تا (تسعة آلاف رجل).

"ڕونکردنەوە"

لەبەر ئەوەی کە باسی عەدەد، باسێکی ووشك و تاڕادەیەك ناخۆش و سەختە لێرەدا بە درێژی ئەو عیبارەتە عەرەبی یەی سەرەوە سەرلەنوێ شەرح دەکەمەوە، و زۆر بە ڕوونی دەیخەمە بەردەست خوێنەری بەڕێزەوە، إنشاء الله. تا تێگەیشتنی بۆ عیبارەتەکەی سەرەوەو جەوهەری باسەکە زیاتربێت: پێش دیسانەوە تەرجومەکردنی مەتنەکە پێویستە ئەم چەند یاساو ڕێسایەی خوارەوە بزانرێت:

*ئیسمی عەدەد: ئەو ئیسمەیە کە دانراوە تاوەکوو دەلالەت بکات لەسەر ئەندازەی شتەکان، یان بە دەستەواژەیەکی تر، ئیسمی عەدەد ،ئەو ئیسمەیە کە دەلالەت لەسەر ژمارە یاخود لە سەر (ترتیب: ڕێکخستن) بکات. ئەو عەدەدەی کە دەلالەت لەسەر ژمارە بکات، بە عەدەدی ئەصلّی، و عەدەدەکە دەلالەت لەسەر تەرتیب، بکات، بە عەدەدی تەرتیبی ناوزەد کراون:*عەدەدی ئەصلّی، لەزمانی عەرەبیدا دەبنە چوار بەشەوە: 1- عەدەدی موفرەد: کە بریتی یە لە (واحد) تا (عشرة) و (مائة) و (ألف). 2- عەدەدی مورەککەب:کە بریتین لە (أحد عشر)، (أثنا عشر)، (ثلاثةَ عشر)، (أربعة عشر)، (خمسة عشرَ)، (ستّة عشر)، (سبعة عشر)، (ثمانيةَ عشرَ)، (تسْعةَ عشرَ). 3-عوقود: کە بریتین لە (عشرون)، (ثلاثون)، (أربعون)، (خمسون)، (ستونَ)، (سبعونَ)، (ثمانونَ)، (تسْعون). 4- عەدەدی مەعطوف، لە (واحدو عشرون: بیست و یەك) تا (تسعٌ وتسعون: نەوەدونۆ) دەگرێتەوە. -عەدەدە تەرتیبی یەکانیش دیسانەوە، وەك: عەدەدە ئەصلّی یەکان دەبنە چوار بەشەوە: (مفرد- مركبّ-عقود-معطوف). أ-عەدەدە موفردە تەرتیبی یەکان بریتین لە: (أوّل- ثاني-ثالث-رابع-خامس-سادس-سابع-ثامِنْ-تاسعْ-عاشرْ). ب-عەدەدی مورەککەبی تەرتیبی لە (حادی عشر) تا (تاسع عشر) دەگرێتەوە. ج-عوقود: لە (عشرون) تا (تسعون) دەگرێتەوە.

د-عەدەدی مەعطوفی تەرتیبی لە (حادي و عشرون) تا (تاسعْ و تسْعون) دەگرێتەوە. *(بنەماکانی عەدەد:أصول العدد) بریتین لە دوانزە وشە بەم تەرتیبە: (واحد-إثنان-ثلاث-أرْبعْ-خمْس-سِتّ-سبْع-ثمان-تسْع-عشر-مائةِ-ألف).

لەفزی (واحد و إثنانْ) لە موزەککەرداو (واحدة و أثنان، یان، ثنتان) لە مؤنثْ دا بەکاردێن، بە گوێرەی یاساو قیاسی زمانی عەرەبی واتە: موزەککەر لەگەڵ

موزەککەر و مؤنث لەگەڵ مؤنث دا دەهێنرێت، وە لەگەڵ (معدود: ژمێراوەکەدا) کۆناکرێنەوە، واتە: ناتوانرێت بگوترێت: (واحدٌ رجُلٌ و إثنانِ رجُلان و واحدة إمرئةٌ وإثنتان امرئتان). بەڵام لەژمارەی سێ تا دە (10-3) بەپێچەوانەی یاساو قیاسە، واتە بۆ مەعدودی موزەککەر ژمارەی مؤنث و بۆ مەعدودی مؤنث. ژمارەی موزەککەر بەکار دەهێنرێت، بۆ وێنە: (ثلاثةُ-رجال) (رِجال) کە جەمعی (رجل)ە، وموزەککەررە، ژمارەکەی لەگەڵ (تاء تأنیث) داهێنراوە، وە لەگەڵ مؤنث دا،ژمارەکە بەبێ (تاء تأنیث) هاتووە، وەك: (ثلاثُ نسوة)، وە وەك ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: (وسخّرها علیهم سبع لیالٍ و ثمانیةً أیام) (سخّر)، فیعلی ماضي یە، و فاعیلەکەی ضە میری شاراوەیە تیایدا، (هاء): مەفعول بە،یەکەمە. (علیهم): جارومەجرورە (سبع): مەفعول بە، دووەمە و هو مضاف (لیال): مضاف إلیە (واو): حەرفی عەطفە (ثمانیة): عەطفە لەسەر "سبع" وهو مضاف (أیام)، مضاف إلیە، کە مەبەست لێرەدا، وشەی (لیال)، کە مؤنثە، و ژمارەی موزەککەری (سبع)ی بۆ بەکارهێنراوە وە هەروەها وشەی (أیّام) کە موزەککەر و ژمارەی مؤنثی بۆ بەکارهێنراوە. هەردوو ژمارەی (یانزدە و دوانزە) بە گوێرەی یاسا و ڕێسا دەچێت بە ڕێوە، بەدەستەواژەیەکی تر بۆ مەعدودی موزەککەر ، عەدەدی موزەککەر و بۆ مەعدودی مؤنث، عەدەدی مؤنث بەکاردەهێنرێت. وەك، (أحد عشر)، (أثني عشر رجلاً)، (إحدى عشرة أمرئة)، (إثنی عشرة أمرئة). بەڵام لە ژمارەی (سێزدە، تا نۆزدە) بە پێچەوانەی قیاسەوەیە، بۆیە بۆ موزەککەر دەوترێت، (ثلاثةٌ عشر رجُلاً) وە بۆ مؤنث .(ثلاث عشرةَ إمرئة) دەگوترێت. موزەککەر و مؤنث لە (عشرین) و هاو وێنەکانی دا (ثلاثون، أربعون، تا،

تسعون) یەکسانن، وەك: (عشرون رجُلاً) و (عشرون إمرئةً) تا (تسعین رجلاً و إمرئةً).
ئەگەر ژمارەگەلێك بینە هاوڕێی (عشرون)ەو هاووێنەکانی لەم کاتەدا لەگەڵ حەرفی عەطفدا دەهێنرێن، بۆ نمونە لە موزەککەردا (أحد و عشرون رجلاً) وە لە مؤنث دا (أحْدی و عشْرون إمرئةً) دەگوترێت، لە نمونەی یەکەمدا (مەعطوف علیه) –أحدٌ– بە موزەککەری و لە نمونەی دووەمدا مەعطوف علیه (أحدی) بە مؤنثی هات. بەڵام لە ژمارەی (بیست و سیّ) تا (نەوەدو نۆ) حوکمەکەی بە پێچەوانەی یاساو قیاسەوەیە. وەك: (تِسعةٌ و تسعین رجُلاً) و (تسعٌ و تسعین إمرئةً) کە لە موزەککەردا مەعطوف علیه (تسعة) مؤنث بوو، وە لە مؤنث دا مەعطوف علیه –تسع– موزەککەر بوو. لە دوو ژمارەی (مائة و ألف – صەدو هەزار دا)، وە هەروەها موسەنناى، ئەم دوانە، (دوسەد و دووهەزار) یەکسانن، بەو مانایەی کە موزەککەرو مؤنث لەم تایبەتمەندیەدا هیچ جیاوازیەکیان نی یە، وەك: (مِاة رجلٍ) و (مأة أمرئةٍ) و (الف رجُلٍ) و (ألْف إمرئةٍ)، و (مأتا رجُلٍ)، و (مأتا إمرئةٍ) و (ألفاً إمرئةٍ) کە لەسەر جەم نمونەکاندا جیاوازیەك لە نێوان موزەککەر و مؤنث دا نی یە. وە کاتێك کە ژمارەکە لە (صەدو هەزار) تێپەڕی. ئەوەی کە زیاد کراوەکەیە لەسەری (سیّ تا نۆ) هەروەك پێشتر حوکمەکەی باسکرا، عەطف دەکرێتە سەر خودی (مائة و ألف) وەك: (مأة و خمسة رجالٍ) و (مأة و خمس نسوةٍ).*بزانەکە: ڕێڕەوی هێنانی ژمارەکان بەم جۆرەیە، کە ژمارەی هەزار بەسەر سەد،دا پێش دەکەوێت، وە هەر بەم شێوازەیش(أحاد: یەکان)ەکان بە سەر (عشرات: دەیان)ەکاندا پێش دەکەون، بۆ نمونە: (هەزار و سەدو بیست و یەك) بەم جۆرە دەهێنرێت: (عندي ألف و مأةٍ و أحد و عشرون رجُلاً). وە هەر بەم شێوازەیش (دوو هەزار و سیّ

سەد و بیست و نۆ) بەم جۆرە دەهێنرێت. (ألفان و ثلاث مأة و إثنان و عشرونَ رجُلاً). وە کاتێك کە بمانەوێت بلێین: (چوار هەزار و حەوت صەد و چل و پێنج) بەم جۆرە دەیلێین: (عندي أربع آلاف و سبعمأة و خمس و أربعون رجُلاً).
*پاشان بزانە: کە هەردوو ژمارەی (واحد و إثنان) بە بیٚ تەمیز، دەهێنرێن، چونکە لەفزی (رجل) و (رجلان) بە تەنهایی دەلالەت لەسەر (واحد و أثنان) دەکەن، بەلاّم ژمارەکانی تری غەیری (واحد و أثنان) پێویستیان بە تەمییز، هەیە. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، تەمیزی (سیّ تا دە) بە جەمعی و بە مەجروری دەهێنرێت، مەگەر لەکاتێکا کە تەمییزی (سیّ تا دە) لەفزی (مأة)بێت، لەم کاتەدا بە موفرەدی و بە مەجروری دەهێنرێت، وەك: (ثلثمأةٍ) کە لەم نمونەیەدا موفرەدەو مەجرورە. وە تەمیزی ژمارەی (یانزە، تا، نەوەدو نۆ) مەنصوب و موفرەدە، وەك: (أحد عشر رجُلاً) لە موزەککەرداو (أحْدى عشرةَ أمرئةً) لە مؤنث دا. و (تسعةٌ و تِسْعونَ رجلاً) و (تِسْعٌ و تسعون إمرئةً). وە تەمییزی ژمارەکانی صەدو هەزار، وە هەروەها موسەنناکانی ئەم دوانە، و جەمعی هەزار، بە مەجروری وموفرەدی دێن، وەك: (مأة رجُلٍ)، (مأتا رجُلٍ)، (ومأةُ إمرئةٍ) و (مأتا إمرئةٍ) و (ألفُ رجُلٍ) و (ألفا رجُلٍ) و (ألفُ إمرئةٍ) و (ثلاثُ آلاف رجُلٍ) و (ثلاثُ آلاف أمرئةٍ). ئێستاش تۆو مانای مەتنەکەی سەرەوە:... وإذا أردتُ التنصیص علی کمیّة شیء فتقول رجل... جەنابی مەلا موحسین دەڵێت: هەرکات تۆ ویستت کە ژمارەو ئەندازەی شتێك دەرببڕی، ئەوا دەڵێیت: (رجُلٌ و رجُلان) واتە: دوو ژمارە ی(یەك و دوو) کە بۆ موزەککەر، بە لەفزی موزەککەر و بۆ مؤنث بە لەفزی مؤنث دەیانهێنیت، بۆیە لە موزەککەردا (واحد و إثنان) و لە مؤنث دا (واحدة و أثنتانٍ) دەهێنرێت. (واحد و أثنان) پێویستیان بە تەمییز نییە، بە دەستەواژەیەکی تر (واحدٌ رجلٌ) و (إثنان رجُلان) و (واحدة إمرئةٌ) و (إثنتان

أمرئتان) ناوترێت. بزانەکە: بۆی هەیە، (واحد و إثنان) ببنە صیفەت بۆ مەعدودەکەی خۆیان، وە لەم کاتەدا لەگەڵیدا هاوڕێك دەبێت، وەك: (رجُلٌ واحدٌ)، (رجُلان إثنان)، (إمرئةٌ واحدةٌ)، (إمرئتان إثنتانِ). چونکە مەبەست لە هێنانی تەمییز، لابردن و سڕینەوەی نادیاری یە لە دوشت: 1-ڕونکردنەوەی ژمارەو ئەندازە. 2-ڕوونکردنەوەی توخم (جنس)ی شتێك. لە لەفزی (رجُل و أمرئة)، (جنس)یش دەزانرێت و هەروەها عەددیش دەزانرێت، هەروەك جەنابی مەلا موحسین، ئاماژەی بەو خاڵە کردووە، کە (رجل) و (رجُلان) بەبێ تەمییز دەهێنرێن، چونکە لەفزی (رجل) و (رجلان) بەتەنهایی دەلالەت لەسەر (واحد) و (إثنان) دەکەن، بەڵام ژمارەکانی تری غەیری (واحد) و (إثنان) پێویستیان بەهێنانی تەمییز هەیە. ئەوکاتە جەنابی مەلا موحسین، دەڵێت: ثم تأتي بالعدد... کەواتە ژمارەکە دەهێنیت، و لە دوای هێنانی ژمارەکە ئەو شتە دەهێنیت، کە ئەو ژمارەیە تەمییز بکات، بەگوێرەی ئەو تەرتیبەی کە من بەهۆنراوە هێناومە: ثماناً بعد ماجاوزت الأثنين بمجموع و مجرور فميّز. ئەو هەشت ژمارەیەی کە لە دوای -دوو- دێن، کە بریتین لە: (ثلاثة، أربعة، خسمة، ستة، سبعة، ثمانية، تسعة، عشرة) تەمیزەکەیان بە صیغەی جەمع و بە مەجروری دێت. وەك: (ثلاثةُ رجالٍ)، (ثلاثُ نسْوةٍ). عندما كان منها قد أضيفت إلى مأة بفردٍ فهو ميّزوە تەمیزی ژمارەکانی نێوان دوو، یانزە کاتێك کە بۆ لای سەد ئیضافەکران، موفرەدن، پێشتر دانەر وتبووی: ژمارەکانی (سێ تا دە) جەمع و مەجرورن، بەڵام کاتێك کە بۆ لای لەفزی (مأة) ئیضافە بکرێن،حوکمەکەیان جیاواز دەبێت، واتە: ئێستا کە بۆلای (مأة) ئیضافەکراون، مەجروربونیان جێگیرو ثابتە، بەڵام بە شێوەی جەمع نایەن، بەڵکو بە شێوەی موفرەد بەکار دەهێنرێن: وەك: (ثلاث مأة رجُلٍ)، (أربعمأةً

رجُلٍ) که لەم دوو نمونەیەدا ، لەفزی (رجُل) تەمیزو بەشێوەی موفرەد و مەجرور بەکار هێنراوە. وفیما بعد عشر فرْداً نصب إلى تسْع و تسعينَ الُميّزْ. وە لەوانەی دا کە لەدوای ژمارەی (دە) و لەپێش ژمارەی (صەد)ەوە، دێن، تەمیزەکەیان بە موفرەدی و بە مەنصوبی بهێنە، واتە: تەمیزی ژمارەی (یانزە) تا (نەوەدو نۆ) مەنصوب و موفرەدە، وەك: (أحد عشر رجُلاً) لە موزەککەرداو (إحدى عشرةً إمرئةً) لە مؤنث دا. ولّما جاز من تسع و تسعين فجُرّ عند ذا فرداً تميّز. وە هەرکات ژمارە لە (نەوەدو نۆ) تێپەڕی کرد، کەواتە: لەم کاتەدا تەمییز مەجرور بکە، لە کاتێکدا کە دەبێت ئەو تەمیزە موفرەد بێت، واتە: تەمیزی ئەو ژمارانەی کە لە صەد زیاترن، موفرەد و مەجرور دەبن، وەك: (مأة رجُلٍ)، (مأتا رجُلٍ)، (مأة إمرئةٍ)، (مأتا مأة رجُلٍ)، (مأتا رجُلٍ)، (مأة إمرئةٍ)، (مأتا إمرئةٍ)، (ألف رجُلٍ)، (ألْف أمرئةٍ) و...

وأما كيفية تذكير الأعداد وتأنيثه، فعلي ما نظمت تسهيلا للضبط:

في ثلاث وسبعة بعده     ذكر أنث بعكس ماشتهرا

وفي الأثنين قبلها وكذا     بعدها ما هو القياس جرى

كل تلك الثمان في التركيب     ماخلا العشر فيه ما استطرا

وادر في العشر عكس ما معه     في سوى كلها السواء ترى

چۆنیەتی هێنانی ژمارە لەگەڵ (تاء)دا، یان بێ (تاء) بە شیعر دامان ڕشتووە، تا بە ئاسانی لەبەر بکرێت:

في ثلاث وسبعة بعده   ذكر أنت بعكس ماشتهرا له سێوه تا نۆ (3، 4، 5، 6، 7، 8، 9) ئەگەز تەمیز موزەککەر بوو با ژمارەکە"مؤنث" بێت، وە بە پێچەوانەشەوە، وەك: (ثلاثة رجلا، ثلاث نساء).

وفي الأثنين قبلها وكذا          بعدها ما هو القياس جرى

واتە (1، 2) پێش ئەم هەشتە بێن، وەك (أحد واثنان) بەبێ (ثلاثة ورابعة و خامسة إلى عشرة) باس دەکرێن، یان دوای ئەو هەشتە بێن، وەك (أحد عشر، اثنا عشر) لەسەر ئەو قاعیدە دەچن کە دەڵێ: ئەگەر تەمیز موزەککەر بوو (عدد)یش موزەککەرە، وەك لە موزەککەردا (أحد واثنان) و لە مؤنثدا (إحدى واثنان) دەوترێ. کل تلك الثمان في التركيب ماخلا العشر فيه ما استطرائەم هەشت ژمارە لەگەڵ (عشرة)دا، جگە لە خودی (10) پێچەوانەی یاسا مەشهورەکەن، کە باس کرا، بۆ نموونە ئەگەر (ثلاثة لەگەڵ دە)دا تەرکیب کرا، یاسا باس کراوەکەی نی یە، کە لە (مؤنث)دا (ثلاث) بە بێ (تاء) و لە موزەککەردا (ثلاثة) بە (تاء)ەوە دەخوێنرێتەوە، (استطرا) واتە: ئەمیش وەك ئەوانەی پێش وایە. وادر في العشر عكس ما معه   في سوى كلها السواء ترىلە (10)دا پێچەوانەی مەشهورە، واتە ئەگەر تەمیز موزەککەر بوو (عشر) موزەککەرە، ئەگەر تەمیز "مؤنث" بوو دەبێت (عشر) مؤنث بێت، هەر لە (10 تا 90) بەم شێوازەیە، وەك: (عشرون، ثلاثون، تسعون) لەمانەدا یەکسانی دەبێت.

"ڕونکردنەوە"

خوێنەری بەڕێز: لەم بەشی دووەمەی هۆنراوەکانی بەشی عەدەددا، ڕوونکردنەوەیەکی ترت ئاراستە دەکەم، تا چاکتر و جوانتر لە کرۆکی باسەکە

بگەیت، إنشاءالله. جا بزانە ئەوەی کە ڕابوردو گوترا دەربارەی چۆنیەتی ئیعرابی تەمییز بوو، ئێستا جەنابی مەلا موحسین دەڵێت: بەڵام ئێستا باسەکە دەربارەی چۆنیەتی بە موزەککەرومؤنث، هێنانی تەمییزە، واتە: چ کاتێك دەبێت تەمییزبە موزەککەری و چ کاتێك دەبێت تەمییزبە مؤنثی بهێنرێت. وە دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە بتوانرێت، ئەم باسە لەبەر بکرێت، ئەوا ڕستەکانم بە شێوەی هۆنراوە هێناوە، بەم شێوەیە: فِي ثلاثٍ وسبعةٍ بعده ذكِّر أنثْ بعكس ما استطرا. لە ژمارەی (سیّ)،و حەوت ژمارەی دوای ئەو دا (أربعة، خمسة، ستة، سبعة، ثمانية، تسعة، عشرة) ژمارەکە دەبێت، بە پێچەوانەی تەمیزەوە بهێنرێت، واتە: ئەگەر تەمیز موزەککەربوو، دەبێت ژمارەکە مؤنث بێت وە ئەگەر تەمیز مؤنث بوو، لەسەرەنجامدا ژمارەکە بە شێوەی موزەککەردەهێنرێت، وەك: (و سخّرها عليهم سبع ليالٍ و ثمانية أيام) کە وشەی (ليال) مؤنثە، وە عەدەدی موزەککەر ی (سبع) یان بۆ هێناوە، وە هەر بەم جۆرەش (أيام) موزەککەرە، کە لەبەر ئەمە، ژمارەی مؤنثی (ثمانية) یان بۆهێناوە. پاشان بزانە: لە زمانی عەرەبیدا ئیسم بۆ موزەککەرو مؤنث دابەش کراوە، بۆ ئیسمی موزەککەر صیفەتی موزەککەرو مؤنث دابەش کراوە، وە بۆ ئیسمی موزەککەرصیفەتی موزەککەربۆ ئیسمی مؤنث صیفەتی مؤنث دەهێنن، وە هەر بەم شێوازەیش ئەگەر فاعیلی فیعل، مؤنث بێت، ئەوا فیعلەکە لەگەڵیدا هاوڕێك و موتابیق دەکەن، بۆ نمونە دەگوترێت: (جاء علي العالم)و(جاءت سعيدة العالمة). وە ضە میرەکەیش دیسانەوە لە ڕووی موزەککەر بوون و مؤنث بونەوە، لەگەڵ ئەو ئیسمەدا کە پەیوەستە پێیەوەو ئەو ضە میرەی بۆ سەر دەگوڕێتەوە ، دەبێت هاوڕێك بن، بۆ نموونە: بۆ (علي) ضە میری (هو) و بۆ (سعيدة) ضە میری(هي) دەهێنرێت. ئیسم و صیفەتی پیاوان و ئاژەڵانی نێر، موزەککەری حەقیقی یە، وە ئیسم و صیفەتی ژنان وئاژەڵانی مێینە مؤنثی

حەقیقین. - ئیسمی مؤنث لە زمانی عەرەبیدا سێ نیشانەی هەیە: 1- "تا ء"وەك: ( رحمة، نعمة). 2- ئەلفی مەقصورەی زائیدە: وەك: (دعوى)،(ذكرى). 3- ئەلف و هەمزە: کە ئەلفی مەمدودەیشی پێ دەوترێت، کە هەرکات زیادە بوو، ئەوە نیشانەی (تأنیث)ە، وەك، (یداء) و (صحراء). ئەو ئیسمە مؤنثانەی کە ناوو صیفەتی ژن یان ئاژەڵی مێینە نەبن، ئەوە بە مؤنثي مەجازی، ناو زەد کراون، ئەو ئیسمانەی کە مؤنثی مەجازین، بریتین لە :

1- ناوی شت (اسم الأشیاء) و ئەو وشانەی کەواتا هەڵدەگرن (المعاني) ئەمەئەگەر نیشانەی (تأنیث)یان پێوە بێت، وەك (حکمة)(عزة).

2- ناوی ئەندامە جوتەکانی لاشە، وەك (ید، رِجل، أذن، عین). 3- ناوی شارەکان : (مصر، بغداد) 4- مؤنثە بیستراوەکان لە عەرەبەوە (سماعی) وەك: (شمس) ، (نفس) (حرب) (روح) (سماء) (أرض) (نار) (حال) (طریق) (دار). لەو مؤنثەتەقدیری یانەدا، تەنها لەفزی (تاء) ئامانج و مەبەستە، وەك: (أرض)، (دار) کە بە گوێرەی یاسای(تصغیر) دەبنە (أريضة) و(دويرة) چونکە گومانی تیادا نی یە کە کە (التصغیر یرد الأشیاء الى أصلها). وە مؤنثی تەقدیری خاوەنی هەشت نیشانەیە، وە یان بەدەستەواژەیەکی تر، مؤنثی تەقدیری دەتوانرێت، بە هەشت شێواز بناسرێت. 1- مؤنث بوونی ئەو ضە میرەی کە دەگەرێتەوە بۆ ئەو شتە، بە مؤنثي ضە میرەکەدا دەزانرێت، کە ئەو وشەیە مؤنثە، وەك: ( ونفس وما سواها ) 2- مؤنث بوونی ئەو ئیسمە ئیشارەیەی کە ئاماژە بۆ ئەو وشەیە دەکات وەك: ( هذه جهنم التي کنتم توعدون)

3- مؤنث بوونی (حال)ەکە، وەك: (هذه الکتف مشویة) 4- مؤنث بوونی (نعت)ە،کەی، وەك: (النفس اللوامة). 5- مؤنث بوونی خەبەرەکەی وەك: (داري معمورة) 6- مؤنث بوونی فیعلەکەی وەك: (رمدت عیني) 7-

8- داکەوتنی (تاء)ە، تەئنیسەکە لە ژمارەکە، وەك (ثلاث ليال)
دەرکەوتنی(تاء)ە، تەئنیسەکە لە کاتی (تصغیر : بچوك) کردنیدا و دەربڕینیدا، وەك (نويرة)کە بچوك کراوەی (نار)ە کە مؤنثی سەماعی یە، وە (بزانە) کە، ئەو وشانەی کە مؤنثی مەجازی بوون، و تائە تەئنیسەکەیان لە لەفزدا دەرنەکەوتووە، بەو مەرجەی کە (ثلاثي: سیانی)بن، وەك: (شمس) و (أرض) و (عين) لەکاتی بچوك کردنەوەیاندا (تاء)یان پێوە دەلکێت، بۆیە بۆ ئەو وشانەی سەرەوە لەکاتی تصغیر کردنیاندا (شمسية)، (أرضية) و( عينية) دەوترێت وەگەر( رباعی: چواری )یان (خماسي: پێنج پیتی) بوو، یاسا ئەوەیە کە(تاء)ە، تەئنیسەکە، نەگەڕێتەوە بۆی وە دەرنەبڕدرێ وەك (عقرب) کە لە تەصغیرکردنیدا (عقيرب) دەگوترێت، وەناگوترێت (عقيربة)و (تاء)ەکەی بۆ ناگێڕدرێتەوە.

وفي الأثنين قبلها وكذا بعدها ما هو القياس جرى. لەو دوو ژمارەیەدا کە (یەك و دوو) کە لە پێش هەشت ژمارەکە (ثلاثة- أربعة- خمسة-ستة- سبعة، ثمانية، تسعة، عشرة) وە دێن وە هەروەها ئەو ژمارەیەی کە لە دوای ئەم هەشت ژمارەیەوە دێت، وەهەروەها ئەو ژمارەیەی کە لە دوای ئەم هەشت ژمارەیەوە دێن، بە جۆرێك بەکار دەهێنرێن، کە هاورێکی قیاس و ڕێسای زمانی عەرەبی بێت، واتە: لەم کاتەدا تەمیزهاورێك و موتابیقە لەگەڵ ژمارەکەدا وەك: (واحد- اثنان)، (احد عشر رجلا)، ( اثنى عشر رجلا) ئەمە لە موزەککەر دا، (واحدة)،(أثنتان)، (أحدى عشرة امرئة) و (أثنتا عشرة أمرئة) لە مؤنث دا. كل تلك الثمان في التركيب ما خلا العشر فيه ما استطرا هەر یەکە لەم هەشت ژمارەیە، (ثلاثة، أربعة، خسمة، ستة، سبعة،ثمانية، تسعة، عشرة) ئەگەر هاتوو، لەگەڵ لەفزی (عشرة)دا خرانە پاڵ یەك، حوکمەکەیان بەو جۆرەیە کە ڕابوردا و ئێستا باسمان کرد. واتە: تەمیز لە ڕوی موزەککەرومؤنث،ەوە، بە پێچەوانەی

ژمارەکەوەیە بەڵام ئەم یاسایە بۆ خودی (عشرة) نا بێت وەك ( ثلاثة عشر رجلا)، (أربعة عشر کتابا) (خسمة عشر کوکبا) ، (ستة عشر درسا) و........
لە تەواوی ئەو نمونانەدا تەمیزەکە لەگەڵ ژمارەی پێش (عشرة)دا لە ڕووی موزەککەرومؤنث،ەوە،پێچەوانەیە، بەڵام تەمیزەکە لەگەڵ لەفزی (عشرة) دا هاوڕێکەو موافیقن وەك (ثلاثةعشر رجلا) لەم نمونەیەدا (رجلا) تەمیزە کە بە پێچەوانەی (ثلاثة)ەوەیە لە ڕووی موزەککەرومؤنث، بونەوە، بەڵام (رجلا) کە تەمیزە لەگەڵ خودی (مؤنث)بونەوە،بەڵام (رجلا) کە تەمیزە لەگەڵ خودی (عشر) دا هاوڕێکە.

وأدرفي العشر عکس ما معه          في سوی کلها السواء تری. بزانە: لە لە فزی (عشر)دا ، یاساکە پێچەوانەو جیاوازە وەك (ثلاثة عشر رجلا)، (خسمة عشر أمرئة) کە لە نمونەی یەکەمدا (عشر) لەگەڵ (ثلاثة)دا لە ڕوی (تذکیر) و (تأنیث)ەوە هاوڕێك نین ،وە هەروەها لە نمونەی دووەمیشدا (عشرة) لەگەڵ (خمس) دا، لە ڕوی موزەککەرومؤنث،ەوە،پێچەوانەیە بەڵام لە(عشرون و ثلاثون..... تسعون ومأة وألف) دا موزەککەرو مؤنث یەکسانن، هەروەك جەنابی مەلا موحسین ئاماژەی بەم مەسەلەیە کردووە،: في السواء کلها السواء تری... واتە: لە غەیری ئەوانەدا کە باس کران، ژمارەکانی تر لە ڕووی موزەککەرو مؤنث بونەوە هاو ڕێکن.

* وەك یاد هێنانەوەیەك تا ئێستا عەوامیلی لەفزی سەماعی باسکراون، بحمد الله، کە (91) دانە بوو، جا بزانە کە لە ڕوی عەمەلەوە سێزدە بەشن بەم جۆرە:

| جۆرەکانیان | ژمارەی وشەکان | عەمەل کردنی |
|---|---|---|
| 1-حروف الجر | 17 | مەجرور کردنی دوای خۆی |
| 2-حروف مشبه بالفعل. | 6 | نەصبی ئیسم و ڕەفعی خەبەر |
| 3- ماولا المشبهّتان بليس | 2 | ڕەفعی ئیسم و نەصبی خەبەر |
| 4- حروف نداء | 7 | مەنصوب کردنی مەعمولەکەی |
| 5- حروف ناصبة | 4 | مەنصوب کردنی فیعلی موضاریع |
| 6- حروف جازمة | 5 | مەجزوم کردنی فیعلی موضاریع |
| 7- أفعال الناقصة | 13 | ڕەفعی ئیسم و نەصبی خەبەر |
| 8- أفعال المقاربة | 4 | ڕەفعی ئیسم و نەصبی خەبەر |
| 9-أفعال المدح والذمّ | 4 | ڕەفع کردنی دوو ئیسم |

| | | |
|---|---|---|
| 10- افعال القلوب | 7 | نەصب كردنى دوو ئيسم |
| 11- أسماء الافعال | 9 | ڕەفع كردن يان نەصب كردن |
| 12- أسماء وكلم المجازات | 9 | مەجزوم كردنى فيعلى موضاريع |
| 13-أسماء ناصبة | 4<br>91عامل | مەنصوب كردنى ئيسمى نەكيرە. |

وإذا سمعت العوامل السماعية، فاستمع السبع القياسية:

الأول منها الفعل: غير ما ذكر وهو معلوم ومجهول، والمعلوم لازم و متعد، فالمتعدي يرفع إسم من قام به على الفاعلية، وينصب إسم من وقع عليه على المفعولية، نحو: ضرب زيد عمروا، واللازم مثله في الأول دون الثاني، إذ هو ما قام ولم يقع، نحو: قام عمرو والفاعل أما ظاهر وقد ظهر أو مضمر بارز أو مستتر والإستتار يجب في نحو: أنت تضرب وأنا أضرب، ونحن نضرب، وأنت اِضرب، وما أحسن زيدا، وفي عدا و خلا وليس ولا يكون، وأسماء الأفعال ما كان لغير الماضي ويجوز فيما عداها نحو: هو ضرب، ويضرب وهي ضربت وتضرب. عەواميلی قیاسی حەوت دانەن. یەکەمیان: فیعلە، ئەوانەی کە باسمان نەکردوون، دەنا (أفعال ناقصە و قلوب ومدح و ذم) ناگرێتەوە، چونکە ئەمانە (سەماعی)ین، نەك (قیاسی). فیعل دوو جۆرە(لازم ومتعدی) مەعلوم دوو جۆرە (لازم و متعدی). فیعلی موتەعەددی ڕەفعە دەدات بەو ئیسمەی کە هەڵدەستێت بە ئیشێك، (بناء) لەسەر فاعلیەت، وە نەصبە دەدات بەو ئیسمەی کە ئیشی تیا دەکرێت (بناء) لەسەر مەفعولیەت، وەك (ضرب زيد عمرا) ضرب: فعل ماضي، زيد: فاعل مرفوع. عمرو: مفعول منصوب. وە فیعلی (لازم) وەك ئەو وایە، واتە لە (فاعلیدا) کە مەرفوعی دەکات، بەڵام لە (مەفعولیەت)دا نایەوێت، چونکە (هەڵساو بە ئیشەکە)ی تیایەو (ئیش تیاکراو)ی نی یە، وەك (قام عمرو). قام: فعل ماضی. عمرو: فاعل مرفوع. (فاعل) یا ظا هیرە، وەك (ضرب زيد) یان (ضمیر)ە، (بارز) دیارە، یان (مستتر) شاراوەیە. ئەو شوێنانەی کە (مستتر وجوبا)ە. 1-لە موفرەدی مذکري موخاطە بی فیعل موضاریعدا، وەك: (أنت تضرب) کە فاعیلەکە موستەتیرە. 2-لە موتەکەللیم (وحدە)ی فیعل موضاریعدا، وەك:

(أنا أضرب) له (أضرب)دا (أنا) موستەتیرە. 3-له (متكلم مع الغير)ی فیعلی موضاریعدا، وەك: (نحن أضرب) كه (نحن) موستەتیرە. 4-له موفرەدی (مذكر)ئەمری (حاضر)دا، وەك: (أنت أضرب) كه (أنت) موستەتیرە (وجوبا). 5-له فیعلەكانی تەعەججوبدا، وەك: (ما أحسن زيدا) كه له(أحسن)دا فاعیل (ضمیر مستتر وجوبا)ە. 6-له فیعلەكانی (أستثناء)دا، وەك: (ما عدا، ماخلا، لیس، لایكون) وەك: (ماخلا زيدا) كه (ضمیر مستتر)ە له (ماخلا)دابە (وجوبا). 7-له (أسماء الأفعال)دا، ئەوانەی كه بۆ غەیری ماضي واتە (مضارع و أمر)ن، كه له (ضرب)دا (هو) موستەتیرە بە جائیزی. (إلى آخره). والمفعول أيضا يكون ظاهرا، نحو: ضربت زيدا، أو مضمرا بارزا لا غير، نحو: ضربته، والفعل قد يتعدى إلى واحد وهو كثير وإلى أثنين، ثانيهما عين الأول أو غيره، وقد مر وإلى الثلاث، وهي أعلم وأرى ونبا وأنبا،وخبر وأخبر، وحدث، نحو: اعملت زيدا عمرا فاضلا، وأريكهم كثيرا وقد يحذف الأول ويذكر الأخيران معا، أو بالعكس كمفعولى باب أعطيت، فالأخيران متلازمان، كمفعولي باب علمت وله معمولات آخر غيرهما منصوبات. (مفعول) یان ظاهیریە، وەك: (ضربت زيدا) مەفعولە، یان (مضمر)ەو دیارە، وەك: (ضربته) كه (ها) مەفعولە، وە (ضمیر مستتر) نابێتە مەفعول بەڵكو پێویستە (بارز) بێت. (متعدی) سێ بەشە: 1-تەعەددا بە مەفعولێ، وەك: (ضرب زيد عمرا). 2-تەعەددا بە دوو مەفعول، وەك: (علمت زيدا فاضلا) كه (زيدا فاضلا) مەفعولن. 3-تەعەددا بۆ لای سێ مەفعول. كه لەم فیعلانەدا دەبێت: (أعلم، أرى.. حدث). وەك ئەو نموونانەی سەرەوە، (أريكهم كثيرا) (ك) مەفعولی یەكەم (هم) مەفعولی دووەم، (كثيرا) مەفعولی سێیەم. هەندێ جار مەفعولی

یەکەم لە سێ مەفعولەکە حە ذف دەکرێ، دوو مەفعولەکەی تر باس دەکرێن یان بە پێچەوانەوە.

هەندێ جار دوو مەفعولی ئاخر حە ذف دەبن، مەفعولی یەکەم ناو دەبرێ، بۆیە دوو مەفعولی ئاخر، وەك: دوو مەفعولەی (بابی أعطیت) یاخود هەردووکیان حە ذف دەبن، یان هەردووك باس دەکرێن، بۆیە ئەم دوو مە فعولەی ئاخر (لازم و ملزوم)ی یەکترن، وەك دوو مەفعولەی بابی (علمت). وە فیعلی موتەعەددی (معمولات)ی تری هەیە. منها ما هو بمعناه، ویسمی مصدراومفعولا مطلقا، نحو: ضربت ضربا، وقعدت جلوسا، وقمت مثل قیامك، ومنها ما هو واقع فیه من زمان أو مكان، ویسمی ظرفا ومفعولا فیه، نحو: صمت یوم الجمعة، وصلیت أمامك، ومنها ما فعل فعل لأجله، ویسمی مفعولا له، نحو: ضربته تأدیبا، وقعدت عن الحرب جبنا، ومنها ما هو فاعل له معنی ویرفع الإبهام عن ذات مقدّرة، نحو: واشتعل الرأس شیبا، وطاب زید نفسا، وآبا وأبوة ودارا وعلما، وأما ما یرفع الإبهام عن ذات مذكورة، فهو معمول لقسم آخر من القیاسیّات سیجیء إن شاء الله تعالی. وەك ئەو مەعمولەی کە بە مانای فیعلی خۆی دێت، کە بە (مصدر، مفعول مطلق) ناو دەبرێن، وەك (ضربتم ضربا) ضربا: مەفعولی موتلّەقە، بۆ (ضربت)، (قعدت جلوسا)، کە (جلوسا) مەفعولی موتلّەقە بۆ (قعدت). (قمت مثل قیامك) (مثل) مەفعولی موتلّەقە بۆ (قمت). (ما هو بمعناه) واتە: ئەو مەفعولەی کە بە مانای فیعلەکەی خۆی دێت، چونکە پێویستە(مفعول مطلق) لە ئەصلّی فیعلەکەی خۆی بێت. (ضربت ضربا) (ضربا) مەصدەرە، وە لە جینسی (ضربت)ە، بۆیە بووەتە مەعمولەبۆ(ضربت) (قعدت جلوسا) کە (جلوسا) مەصدەرە، و لە جینسی (قعدت)ە، هەرچەند لە لەفزدا جیان، بەلاّم لە مانادا

یەکن، چونکە لە (مفعول مطلق)دا ئەگەر لەفزیان جیابوو مانایان یەك بوو هەر دروستە. چونکە (جلس، قعد) یەك مانان، بۆیە (جلوسا) مەفعول موتلەقە بۆ (قعدت). (قمت مثل قیامك) کە مەفعول موتلەق مەصدەر نەبوو، وەك (مثل) کە موضافە، بۆ لای مەصدەر، کە لێرەدا (مضاف)ە بۆ لای (قیام)، بۆیە (مصدریت)ی خۆی بۆ لای موضاف بە (قیام) کردووە، بۆیە (مصدریت)ی خۆی لە(مضاف إلیه)ەوە وەرگرتووە، هەندێ لە مەعمولات، فیعلی ئەو مەعمولەیە، کە ئەو مەفعولە، واقیع کراوە، کە لەو مەکان و زەمانەدا، واتە ئەو مەفعولەی کە ئەو (زمان و مكان)ە بە (ظرف و مفعول فیه)یان پێ دەوترێ، دوو بەشە: 1-مەفعول فیه زەمانی وەك: (صمت یوم الجمعة). (یوم) مەفعول فیه. 2-مفعول فیه مەکانی وەك: (صلیت أمامك) (امامك) مەفعول فیه. وە (مفعول له) ئەوەیە کە فیعلەکە بە هۆیەوە ئەنجام دراوە، وەك (ضربته تأدیبا) مەفعول لَهُ، وە (قعدت عن الحرب جنبا) کە (جنبا) مەفعول لَهُ، کە لە ئەصڵدا (للتأدیب و للجبن) بووە. وكلاهما یسمى تمییزا، وهو لا یكون إلا نكرة، ومنها ما یبین هیئة الفاعل عند صدوره عنه والمفعول عند وقوعه علیه، ویسمى حالا، نحو: جئت راكبا ورأیتها راكبة ورأیته راكبین وقد یحذف عاملها وجوبا، نحو: زید أبوك عطوفا، أي أحقه عطوفا، وبعه بدرهم فصاعدا، أي فاذهب صاعدا وتلزم لها النكارة، ومنها المنصوب بنزع الخافض، نحو: جاءني و تعسفن رملا، أي جاء إليّ وصارت النعاج في الرمل. وە (تمیز) ئەوەیە کە (معنای فعل) و(جمله)و(ذات معین) دیاری دەکات، بۆیە لەسەر (حوکمی فاعیل)ی هەیەو لە لەفزدا فاعیل نی یە، بۆ نموونە: (واشتعل الرأس شیبا) (شیبا) تەمیزە، مووی سەر (سپی) بوو، کە (شیبا) جیا دەکاتەوە. (طاب زید

نفسا) (نفسا) تەمیزە، (نفسا) جیا دەكاتەوە. (طاب زيد أبا) (أبا) تەمیزە، (أبا) جیا دەكاتەوە. (طاب زيد علما) (علما) تەمیزە، (علما) جیا دەكاتەوەو موعەییەنی دەكات. (تمیز) هەمیشە (نكرە)یە: (كلاهما) واتە ئەو تەمیزەی كە بۆ (ذات مقدرة) یان بۆ (ذات مذكورة)یە كە (ذات مذكورة) لە حەوتەمین (عواملی قیاسی)دا باس دەكرێت، إن شاء الله تعالى. (حال) چۆنیەتی حال (فاعل و مفعول) لە كاتی ڕوودانەكەدا دەردەخات، وەك: (جئت راكبا) كە (راكبا) حاڵە. هەندێ جار (عامل) حەذف دەبێت، وەك (زيد أبوك عطوفا) كە لێرەدا (عطوفا) حاڵە، وە (عامل) لە (عطوفا)دا (أحق)یە، كە فیعلە و حەذف كراوە، وە هەروەها وەك (بعه بدرهم فصاعدا) كە (فاذهب صاعدا) بوود، كە (أذهب) عامیلی (صاعدا) بووە، حەذف بووە. وتلزم لها النكارة: (النكارة): واتە: (نكرە) یەكێك لە شەرتەكانی (حال) ئەوەیە كە (نكرە) بێت، بۆیە ئەگەر (حال) مەعریفە بوو ئەوا تەئویل بە (نكرە) دەكرێتەوە. لە هەندێ لە (معمولات)ەكان (منصوب بنزع خافض) واتە ئەوەی كە حەرفی جەڕی لە پێشەوە بووەو حەذف كراوە، ئیتر لە جیاتی مەجروری مەنصوبی پێ بەخشراوە، وەك: (جاءني و تعسفن رملا) كە لە ئەصڵدا (جاء إلى) بووە، (إلى) حەذف كرا، و (ياء) بە (جاء)ە وە لكا. مەبەست (فى الرمل)ە، كە (فى) حەذف كراو (رمل) كە مەجرور بوو مەنصوب كرا. مانای جوملەكە: هات بۆ لام و مێیەكان چووبوونە كێڵگەكە. وأما المفعول معه،والمستثنى فليسا من معمولاته، بل عاملهما سماعي كما قدمناه. وأما المجهول فيبنى من المعلوم بتغيير الصيغة ويحذف الفاعل ويقام معمول آخر مقامه، ومرتفع به ويسمى مفعول ما لم يسم فاعله، ولا يصلح لذلك الثاني من باب علمت ولا المفعول له والمفعول فيه، والحال والتمييز كذلك.وأما غيرها

فإن وجد المفعول به تعين له والاول من باب أعطيت، أولى من الثاني و ألا فالجميع سواء نحو: ضرب زيد يوم الجمعة أمام الأمير ضربا شديدا في داره. (مفعول معه) ئەوەیە کە لەگەڵ (واو)ی بە مانا (مع)دا دێت.(مستثنى) ئەوەیە لەگەڵ (إلا و أخوات إلا)دا دێت. ئەم دووانە لە (معمولات)ی فیعل نین، واتە فیعل عەمەلیان تیا ناکات، بەڵکو عامیل تیایاندا سەماعی یە، وەك لەعەوامیلی سەماعی دا باس کرا. (فعلی مجهول) لە (فعلی معلوم) دروست دەکرێت، بە گۆڕینی صیغەکەی، وە بە حە ذف کردنی (فاعل) و دانیشتنی مەعمولی تر لە جێیدا، وە بە هۆی فیعلەکەوە مەرفوع دەبێت، وە هەموو مەعمولێك لە جێی فاعیل دانانیشێ، وەك (علم درهم زيدا) چونکە مەفعولی دووەم لە ئەصڵدا (خبر)ە بۆ مەفعولی یەکەم، وە مەفعولی یەکەم (مبتدا)یە. وە (مفعول له) لە جێی فاعیل دانانیشێ، چونکە سەبەبیەت تیا دەچێت، وە ئەو کاتە دەڵێت: (ضرب تأديب) کە نادروستە. وە (مفعول معه) لە جێی فاعیل دانانیشێ. وە (حال) نابێتە (نائب فاعل). (تميز) نابێتە (نائب فاعل). بەڵام لە غەیری ئەم پێنج شوێنەدا، ئەگەر (مفعول به) هەبوو، ئەوا (مفعول به)یە بۆ بوونە (نائب فاعل) دادەنرێت، بۆیە (مفعولی أول)ی بابی (أعطيت) لە مەفعولی دووەمی لە پێشترە کە بکرێتە (نائیب فاعیل) و بەڵام ئەگەر (مفعول به) نەبوو، (مفاعل)ەکانی تر بوون، ئەوا یەکسانن کە ببنە (نائیب فاعیل) یا نا..... وەك: (ضرب زيد يوم الجمعة) کە ئەصڵەکەی (ضربت زيد يوم الجمعة) بووە کە (زيدا) مەفعول بە،کە لێرەدا کە مەجهول کرا(زيدا)کرایە(نائب فاعل)،چونکەمەفعول فیە،دروست بوو.

(ضرب زيد ضربا شديدا في داره) (ضربا) مفعول مطلق، کەچی (زيد) بوویه (نائب فاعل)، (تعين له) ضه میري (تعين) نائیب فاعیلەکە دەگرێتەوە (له) مفعول به دەگرێتەوە. تنبيه: قد يحذف الفعل أما جوازا، كقولك: زيد، لمن قال من قام؟ وأما وجوبا كما في باب التحذير نحو: إياك والأسد، أي بعد نفسك عن الأسد، والأسد من نفسك وإياك من الأسد، أي بعد نفسك من الأسد، وإياك أن تحذف بتقدير من أي بعد نفسك من حذف الأرنب والطريق الطريق أي اتق وباب ما أضمر عامله وهو مفعول حذف فعله مع التفسير، نحو: زيدا ضربته أي ضربت زيدا فحذف فعله وفسر بضربته. ئاگاداری: فیعل حه ذف دەبێت، (جوازا) وەك ئەوەی بڵێیت: من قام؟ له وەڵامدا بڵێیت: (زيد) كه (قام زيد) بووه، (قام) حه ذف کرا. یاخود (وجوبا حذف) دەبێت، وەك له بابی (تحذير، ترساندن)دا هەیه، وەك (إياك والأسد) دەخیلت بم شێرەکە، که ئەصڵەکەی (بعد نفسك عن الأسد) بووه. و (الأسد من نفسك) که (بعدو من نفس) حه ذف بووه، یاخود (إياك من الأسد) که (بعد، نفس) حه ذف بووه، یاخود (إياك أن تحذف) که (بعد نفس من حذف الأرنب) بووه. وه که دەوترێ (الطريق، الطريق) واته: (أتق) بترسه. وه ئەوەی که عامیلەکەی شاراوەیه، و مەفعولیشه، که حه ذف کرا، ته فسیر دەکرێت، بۆ نموونه: (ضربت زيدا) که (زيدا) حه ذف کرا، دەڵێیت (ضربته) که (هاء) جێگای دەگرێتەوەو تەفسیری (زيد) دەکات. وه هەروەها له نموونەی (زيدا ضربته)دا (ضربته) حه ذف کرا، که له (ضربته)دا جێگای دەگرێتەوە. وباب الإختصاص نحو: نحن العرب أسخى الناس للضيف أي نخص العرب، وباب المدح والذم والترحم، نحو:الحمد لله أهل الحمد، ومررت بزيد الفاسق والمسكين أي أعنى أهل الحمد، وأعني الفاسق والمسكين وباب الإغراء، نحو: الغزال الغزال أي أرمه. له بابی

(إختصاص)دا، فيعل حه ذف دەبێت، وەك: (نحن العرب أسخى الناس للضيف)، واته (نحن العرب) عەرەب تايبەت دەكەين وە له (مدح و ذم و ترحم)دا وەك: 1-الحمد لله أهل الحمد: كه لێرەدا (الله) مەدح كراوەو له پێش (أهل)دا كه مەنصوبه (أعنى)يەكی حه ذف هەيه. 2-مررت بزيد الفاسق والمسكين، كه پێش (فاسق والمسكين) (أعنى) هەبووە. وە (إغراء) واته ئاگادار كردنەوە بۆ كارێكی باش كه دەڵێت: (الغزال الغزال) واته: (أرمه) ڕەمی بكە. الثاني: المصدر، وهو يعمل عمل فعله، لازما أو متعديا، معلوما أو مجهولا، فالمعلوم نحو: بلغني قيام زيد وأعجبني ضرب زيد عمروا يوم الجمعة أمام الأمير ضربا شديدا تأديبا له ولله درهُ فارسا. والمجهول نحو: وهم من بعد غلبهم سيغلبون، أي من بعد أن غلبوا وأعماله باللام ضعيف وقد يضاف إلى الفاعل والمفعول على إعرابه، نحو: أعجبني ضرب زيد عمروا، وبالعكس نحو: أعجبني ضرب عمرو زيد. دووەم: مەصدەرە. كه عەمەلی فيعلەكەی ئەكات، ئەگەر فيعلەكه لازم بوو، عەمەلی فيعلی لازم ئەكات، وە ئەگەر موتەعەددی يان مەعلوم يان مەجهول بوو عەمەلی ئەو فيعله ئەكات، وەك: (بلغني قيام زيد)، بلغ: فعل ماضي. ن: وقايةمفعول. قيام: مصدر قام. وفاعيلی (بلغ)يه. زيد: موضاف إليه. فيعلی (قام) مەعلوم و لازمە. (أعجبني ضرب زيد عمروا) (أعجب): فعل. (ن): وقاية. مفعول. (ضرب): فاعل (أعجب). (زيد): موضاف إليه. (عمروا): مەفعول. كه ئەم جومله بۆ (معلوم و متعدی)يه. (ضرب) مەبەستی ئێمەيە:كه مەصدەری (ضرب)يه، وە فاعيل و مەفعولی له خۆ گرتووە، ئينجا (أعجبني ضرب زيد يوم الجمعة) بۆ مەفعول فيه، زەمانی يه. (أعجبني ضرب زيد أمام الأمير) مەفعول فيه مەكانی يه. (أعجبني ضرب زيد ضربا

شديدا) مەفعول موتلەقە بۆ (ضرب). (أعجبني ضرب زيد تأديبا) لە مەفعول لَهُ كە عاميل تيايدا (ضرب)يە. ولله درة فارسا. (در): مەصدەرە، ئيضافە كراوە بۆ لای فاعيل. (فارسا): تەميزە. بەهەرحالّ مەصدەر دەتوانێت وەك فيعلی موتەعەددی عەمەل بكات. بەلاّم مەجهول، وەك: (وهم من بعد غلبهم سيغلبون). هم: مبتدأ. من بعد: جار ومجرور. وخبر وهو مضاف. غلب: مضاف إليه وهو مضاف. (هم): مضاف إليه. (سيغلبون): فعل وفاعل. مەبەست (غلب)ەيە.كە مەصدەری (غلب)يە لە جێی فيعلی مەجهولدا، دانيشتووە. كە ئەصلّەكەی (من بعد أن غلبوا) بووە، كە فيعلی ماضي مەجهولە، وە بزانە مەصدەری (مع اللام) عەمەلەكەی ضە عيفە. وە هەندێ جار مەصدەر ئيضافە دەكرێت بۆ لای فاعيل ومەفعول وەك خۆی دەمێنێتەوە، وەك (أعجبني ضرب زيد عمروا) كە (ضرب) موضافە بۆ لای (زيد) و (عمرو) مەفعولە، وەك خۆی ماوەتەوە، وە بە پێچەوانەشەوە، (مصدر) ئيضافە دەكرێ بۆ لای مەفعول و فاعيل، وەك خۆی دەمێنێتەوە، وەك: (أعجبني ضرب عمرو زيد) كە (ضرب) ئيضافەيە بۆ لای (عمرو) كە مەفعولەو (زيد) فاعيلەو وەك خۆی ماوەتەوە. وقد يحذف أحدهما والآخر على إعرابه أو مجرورا بالإضافة ولا يتقدم معموله عليه، ولا يضمر فيه وتابعهما في الجر يتبع اللفظ والمحل، نحو: عجبت من ضرب زيد الظريف والظريف. ومن أكل الخبزواللحم واللحم وفي الرفع والنصب اللفظ. هداية: اسم الحدث، وهو أن كان علماكفجار للفجرة أو بميم كالمحمدة، أو على زنة مصادر الثلاثي وهو لغيره، نحو: أغتسل غسلا، وأتوضأ وضوءا، فإسم مصدر وإلا فمصدر كالضرب والاكرام.

وە هەندێ جار (فاعل يان مفعول) حە ذف دەبێت، ئەوی تريان دەمێنێتەوە، كە دوو جۆرە: أ.هەندێ جار فاعيلی مەصدەر حە ذف دەبێت، وە مەفعول وەك

خۆی ئەمێنێتەوە، وەك (أو إطعام في يوم ذي مسغبة* يتيما) كە (يتيما) مەفعولي (إطعام)ە، وە فاعیلەکەی مە حذوفە کە (إطعام) مەصدەرە. ب.هەندێ جار مەفعول حە ذف کراوە، وە فاعیل وەك خۆی وایە، وە هەندێ جار (فاعل یان مفعول) حە ذف دەبێت،ئەوی تریان مەجرور دەبێت بە هۆی موضاف بوونی مەصدەرەوە، کە دوو جۆرە: أ.فاعیلی مەصدەر حە ذف کرابێت، وە مەفعول مەجرور بێت، وەك: (أو فك رقبة) کە (فك): مەصدەرە وموضافە بۆ لای (رقبە) و فاعیل حە ذف بووەو مەفعول مەجرورە. ب.مەفعول مە حذوف بێت و فاعیل مەجرور بێت، وەك: (ضربة علي يوم الخندق أفضل من عبادة الثقلين) (ضربة) مەصدەرە، وموضافە بۆ لای (علی) وە مەفعول کە کابرایەکە بەناوی (عمرو بن عبد ود)ە حە ذف بووە. وە بزانە مەعمولی مەصدەر بەسەر (مصدر)دا تەقدیم ناکرێت، ناوترێت (عمروا ضرب زید) وە ضە میر لە مەصدەردا ناهێنرێ. وە تابیعی فاعیل و مەفعولی مەصدەر لە مەجروریدا لە (لفظ ومحل)دا شوێنی دەکەوێ ، وەك: 1-(عجبت من ضرب زيد الظريف) کە (الظريف) صیفەتە بۆ (زید) بە هۆی لەفزی (زید)ەوە مەجرورە، وە بە هۆی (محل)ی زەید کە فاعیلە، مەرفوع دەبێت. 2-(عجبت من أكل الخبز واللحم) ئەگەر (اللحم) مەجرور بێت، چونکە شوێنی (لفظ)ی (الخبز) کەوتووە، وە ئەگەر مەنصوب بێت، بەهۆی (محل)ی (الخبز)ەوەیە، کە مەفعولە. وە لە (رفع ونصب)دا (لفظا) شوێنی دەکەوێ نەك (محلا)، وەك: (أعجبني من ضرب زيد عمروا الظريف) کە (الظريف) بە موضمە ری و شوێنی (عمرو) کەوتووە، وەك: (أعجبني من ضرب عمرو زيد الظريف) کە (الظريف) بە موضمە ری و شوێنی (زید) کەوتووە لە لەفزدا. الثالث: اسم الفاعل: وهو يعمل عمل فعله المعلوم

بشرط الحال والإستقبال والإعتماد على المخبر عنه أواللام الموصولة أو الموصوف أوكان حالا أو بالهمزة أو حرف النفي أوالنداء، نحو: يا طالعا جبلاوما قائم زيد وأضارب زيد أخاه، وجاءني زيد راكبا فرسه،وجاء رجل ضارب أبوه غلامه، والضارب أبوه بكرا،وزيد ضارب غلامه عمروا يوم الجمعة. ڕێنموونی: اسم الحدث: ئەو ئیسمەیە دەلالەت ئەکات لەسەر ڕووداوێك، (ملا محسن) بۆ ناسینی (مصدر و اسم مصدر) سێ ڕێگا دادەنێت: 1-(اسم مصدر) ئەگەر عەلەم بوو وەك (فجار) کە عەلەمی (فجرة)یە بۆیە (فجار) ئیسمە بۆ خاوەن خراپەکان، بۆیە (اسم مصدر)ە. 2-ئەگەر (اسم حدث)ەکە (میم)ی پێوە بوو، (اسم مصدر)ە، وەك: (محمدة). 3-ئەگەر (اسم حدث) لەسەر وەزنی (ثلاثي مجرد) بوو، وەك: (غسلا). یاخود (ثلاثي مزید فیە) وەك: (إغتسل) ئەوە(اسم مصدر)ە. ئەگەر لەم سیانە بەدەر بوو (مصدر)ە، وەك: (ضرب، أکرم).

**اسم فاعل:** ئیسمی فاعیل عەمەلی فیعلی مەعلوم دەکات، واتە کە لازم بوو، تەنها فاعیلی بەسە، وە کە (متعدی) بوو مەفعولی پێویستە، بە مەرجی ئەوەی کە: 1-بۆ کاتی (حال) بێت. 2- بۆ داهاتوو بێت. 3-ئیعتیماد بکاتە سەر (مبتدأ). 4-ئیعتیماد بکاتە سەر (لام الموصول)ە. 5-ئیسم فاعیل صیفە بێت و ئیعتیماد بکاتە سەر مەوصوف. 6- (حال) بێت بۆ (ذي الحال). 7-لەگەڵ هەمزەی ئیستیفهامدا بێت. 8-(حرف نداء)ی بچێتە سەر. 9-لەگەڵ حەرفی نەفی دا بێت، وەك: 1-یا طالعا جبلا. (طالع) ئیسم فاعیلە، (حرف نداء)ی چووەتە سەرو عەمەلی کردووە، (جبلا)ی مەنصوب کردووە. 2-ما قائم زید: حەرفی (نفی) چووەتە سەر (زید) و مەرفوعی کردووە. 3-أضارب زید أخاه: ئیستیفهامی چووەتە سەر. 4-جائني زید راکبا

فرسه: فاعيل كه (راكبا) حالّه بۆ (ذي الحال) كه (زيد)ه. 5-وجاء رجل ضارب وغلامه. مەفعوله. 6-الضارب أبوه بكرا: (الضارب) ئەلف ولامی مەوصولی چووەته سەر. 7-زيد ضارب غلامه عمروا يوم الجمعة: ضارب: خەبەرە، وموبتەدای لە پێشەوە هاتووە. وإن كان باللام فيعمل مطلقا، والتثنية والجمع كالمفرد، وهكذا صيغ المبالغة في جميع ما ذكر، نحو: جاء رجل ضراب غلامه، ويضاف إلى فاعله ومفعوله وتابعه كتابع المصدرنحو: زيد ضارب عمرو وبكر وبكرا. ئیسمیی فاعیله كه لەگەڵ لامی مەوصولدا هات بە بێ هیچ شەرتێك عەمەل دەكات، وە (تثنية وجمع) لە ئیسمی فاعیلدا، وەك موفرەدەكەی عەمەل دەكات. صیغەی مبالغة: بە گوێرەی ئەو مەرجانەی پێشو عەمەل دەكات، وەك: جاء رجل ضراب غلامه، (ضراب) مبالغة، و صیفەتە بۆ (رجل) كە پشتی بە مەوصوف بەستووە. وە بزانە( اسم فاعل) ئیضافە دەكرێ بۆ لای (فاعل و مفعول)ەكەی و تابیعەكەی حوكمی وەك تابیعی مەصدەر وایە: (زيد ضارب عمرو وبكر وبكرا) ئەگەر (بكر) بە مەجروری بخوێنینەوە ئەوە عە طفە لەسەر لەفزی (عمرو) و ئەگەر بە مەنصوبی بیخوێنینەوە عە طفە لەسەر (محل)ی (عمرو) كە مەفعولە. الرابع اسم المفعول: وهو يعمل عمل فعله المجهول بشرائط اسم الفاعل نحو: أمضروب زيد يوم الجمعة أمام الأمير ضربا شديدا في داره. والحوض مملوء ماء ويضاف إلى فاعله، نحو: زيد مضروب أبيه وإن شئت تنصبه تشبيها بالمفعول والفاعل مستتر فيه، ففيه ثلاثة أوجه، وكذا اسم الفاعل اللازم. چوارەم: ئیسمی مەفعوله. ئیسمی مەفعول وەك (فعلی مجهول) وایەو نائیب فاعیل هەڵدەگرێ، لەسەر ئەو مەرجانەی ئیسمی

مەفعول کە باس کران، بۆ وێنە: 1-أمضروب زید یوم الجمعة. (زید): نائیب فاعیل، بۆ (مضروب).

2-أمضروب زید أمام الأمیر. کە (أمام الأمیر) مەفعول فیە مکانی یە. 3-أمضروب زید ضربا شدیدا. کە (ضربا) مەفعول موتڵەقە

4-الحوض مملوء ماء: کە (الحوض) موبتەدایە، (مملوء) ئیسمی مەفعولە و ئیعتیمادی لەسەر (مبتدأ) کردووە. وە (اسم مفعول) ئیضافە دەکرێت بۆ لای (فاعل) وەك: (زید مضروب أبیە) (أبیە) نائیب فاعیل و (مضاف إلیە)یە، بۆ (مضروب). وە ئەگەر دەتەوێ نائیب فاعیل مەنصوب بکەیت تا ببێتە شەبیهی مەفعول، ئەوا فاعیل ضە میرێکی موستەتیرە، لە (اسم مفعول)دا. بۆیە لە (أبیە)دا سێ شێواز دروستە: 1-مەرفوع بێت، لەسەر (نائیب فاعیل)ی. 2-مەجرور بێت بە هۆی ئەوەی کە (مضاف إلیە)یە. 3-مەنصوب بێت، بەهۆی ئەوەی کە مەفعولە بۆ (مضروب) و فاعیل لەناو (مضروب)دا موستەتیرە.

الخامس: الصفة المشبهة: وهي مشتقة من فعل لازم لمن قام به على معنى الثبوت لا الحدوث، ويعمل عمل فعله، نحو: زيد حسن وجهه و زيد طيب أبوه. ومن العوامل القياسية اسم التفضيل، نحو: ما رأيت رجلا أحسن في عينيه الكحل منه في عين زيد وهذا بسرا أطيب منه رطبا. پێنجەم: صیفەی موشەببیهە. کە لە فیعلی لازم (مشتق) کراوە، وە جیاوازی لەگەڵ ئیسمیی فاعیلدا ئەوەیە کە (اسم فاعل) (حدوث) ئەوەی کە بە کارەکە هەڵدەستێ، بەڵام (صفەی مشبە) (ثبوت)ە، واتە بۆ (ثابت) بورن، وە تیا ناچێت، جیاوازی (حدوث) و (ثبوت): (حدوث): تیا دەچێت . بەڵام (ثبوت): بەردەوام هەیە.

صیفەی موشەببیهە عەمەلی فیعلی خۆی دەکات، واتە فاعیل مەرفوع دەکات، وەك (زيد حسن وجهه). (زيد): مبتدأ. (حسن): خبر وصفه مشبه، كە (وجهه)ی مەرفوع کردووە. وە (زيد طيب أبوه). طيب: صفة مشبه و (أبوه)ی رەفع کردووە.

ئیسمیی تە فضیل: لە عەوامیلە قیا سیەکانە، وەك: (ما رأيت رجلا أحسن..) كە (أحسن) ئیسمیی تە فضیلە و (كحل)ی مەرفوع کردووە، (بناء) لەسەر فاعیلیەت. وە لە نموونەی دووەمدا (أطيب) ئیسم فاعیلە. پرسیار: بۆ دوونموونەی هێناوە؟وەلاّم: چونکە ئیسمیی تە فضیل لە یەکەمدا بۆ ئیسمیی ظاهیرە، وە لە دووەمدا بۆ (ضمير)ەوعەمەلی تیایاندا کردووە. هذا: مبتدأ. أطيب: خبر. سبرا و رطبا: حال. هذا: ذي الحال. بۆ سبرا و (منه) ذي الحال بۆ (رطبا). السادس: المضاف وهو كل اسم نسب إلى شئ وجره بتقدير اللام أو من أوفي ويسمي المجرور مضافا إليه، نحو:هذا غلام زيد وخاتم فضة وضرب اليوم، وقد يقع الفصل بينهما، نحو: في بئر لاحور وهذا غلام والله زيد.

شەشەم موضاف: ئەویش ئەو ئیسمەیە كە نیسبەت بدرێتە لای شتێکی تر، وە مەجرورە بە هۆی حەرفێکی (جر)ی موقەددەرەوە، كە (لام يا من يان في) وە مەجرورەکە بە (مضاف إليه) ناو دەبرێت، وەك: (هذا غلام زيد) كە لە ئەصلّدا (هذا غلام لزيد)ە. (خاتم فضة) كە (خاتم من فضة)یە. (ضرب اليوم) كە (ضرب في اليوم)ە. وە هەندێ جار (فصل) لە بەینی (مضاف و مضاف إليه)دا هەیە، وەك: (في بئر لاحور) كە (لا) لە بەینیانا هەیە. وە (هذا غلام والله زيد) كە (والله) کەوتە بەینی (مضاف و مضاف إليه). السابع: كل اسم مبهم قد تم بأحد الأشياء الأربعة: التنوين ونون التثنية

وشبه الجمع والإضافة، وهي تنصب اسما منكرا ويسمى المنصوب مميزا، نحو: عندي رطل زيتا ومنوان سمنا وعشرون درهما وملؤه عسلا، وقد عد الثالث من السماعية. حەوتەم: ئیسمی موبهەمە، نادیارە: ئەویش ئەوانەیە کە بە (تەنوین، نون تثنية، شبه جمع، إضافة) کۆتایی بێت. ئەوەی بەم چوارە کۆتایی هات، ئیسمێکی نەکیرە مەنصوب دەکات، وە بە (تمیز) ناو دەبرێ. وەك: 1- عندي رطل زيتا. مەبەست (رطل) کە بە (تنوین) کۆتایی هاتووە، وە (زیتا)ی مەنصوب کردووە کە تەمیزە. (عندی): خبر مقدم. (رطل): مبتدأ مؤخر. 2-عندي منوان سمنا. کە (منوان) بە (نون) کۆتایی هاتووە، وەك پێشوو وایە. 3-عندی عشرون درهما. کە بە (نون)ی(شبه جمع) کۆتایی هاتووە. وە (عشرون) جەمعی نی یە، چونکە جەمع ئەوەیە کە موفرەدی هەبێت و (عشرون) موفرەدی نی یە. 4-عندي ملؤه عسلا. کە (ملؤه) موضافە. (وقد عد الثالث من السماعية). واتە: سێیەم کە (شبه جمع)ە بە سەماعی حیساب کراوە.

العامل:أما لفظي وقد بان وأما معنوي وهو معنيان، معنى يرفع غير المبتدأ والخبر وهو تجرده عن النواصب والجوازم، نحو: تضرب تضربان، ومعنى يرفع المبتدأ والخبر وهو تجرده عن العوامل اللفظية للإسناد، نحو: زيد قائم، فزيد مبتدأ وعامله تجرده عن العوامل اللفظيةلأسنادالقيام أليه، وقائم خبره، وعامله التجرد عنها لإسناده إلى زيد، ونحو: ما قائم الزيدان وأقائم الزيدان. فقائم في المثالين مبتدأ وعامله التجرد لإسناده إلى زيد ونعني بالعوامل اللفظية هنا ما لا يكون زائدة فدخل نحو: هذا بحسبك و بحسبك هذا والحمد لله. وهذا خلاصة ما أوردناه وهو جزء مما يدخرون ليوم لا ينفع فيه مال ولاً بنون ولمثل هذا فليعمل العاملون. عامیل دوو جۆرە، یان (لفظ)ی یە، وەك باس کرا، یان

(معنوی)یه که دوو جۆره: یەکەمیان: لە غەیری موبتەدا و خەبەر ڕەفعە دەدات بە هەموو شتێ، وە ئەو عامیلەی کە وایە، چونکە موبتەداو خەبەرەکە ئەداتی (ناصبەو جازم)ی لەسەر نی یە، وەك: (تضرب ضربان) مەرفوعن، کە ڕەفعەی (تضرب) بە ضە مەیە، وە ڕەفعەی (تضربان) بە (ألف و نون)ي تە ثنیە یە، پێویستە بزانین کە عامیل لە ڕەفعدا چی یە؟ عامیل لە ڕەفعدا هۆی ئەوەیە کە خالّی یە لە (ناصب و جازم) دەنا مەرفوع نەدەبوو، بۆیە ڕافیعی (مبتدأ وخبر) مەعنوی یە، کە ئەویش بە هۆی (إسناد)ەوەیە، وەك (زید قائم) زید: مبتدأ. قائم: خبر. وە هۆی نیسبەت دانی موبتەدا وخەبەر، بە یەکەوە. (قائم): خەبەرە کە ئیسناد دراوەتە لای زەید. وە موبتەدا دوو جۆرە: 1-ئیسمیی. 2-وەصفی. وەك: (ما قائم الزیدان) و (اقائم الزیدان) کە (قائم) لەم دوو نموونەدا (مبتدا)یەو عامیلی موبتەداکەی ئەوەیە، کە(ناصب وجازم)ی پێوە نی یە، وئیسنادی دراوەتە لای (زید). العوامل اللفظیة: ئەوانەن کە زائیدە نەبن، وەك:

1-هذا بحسبك. (هذا) مبتدأ. (بحسبك): خبر. (باء): زائیدەیە، بۆیە لەفزی نی یە. 2-بحسبك هذا. (بحسبك): مبتدأ. (هذا): خبر (باء): زائیدەیە، بۆیە لەفزی نی یە. چونکە لەفزیی ئەوەیە کە حورووفی زائیدەی نەبێت، کەوابوو مەعنەوی یە.

ئەوا لێرەدا شەرحی (عوامل ملا محسن)م تەواو کرد، لە دوای عەسری رۆژی (2000/2/7م) لە دێی ئەحمەد ئاوای سەر بە ناوچەی هەورامان – شارەزوور. سوپاس بۆ خوای گەورە.

الحمد لله والصلاة والسلام على خير الورى، فهذا آخر ما أوردناه وما سودنا به الصفحات البيضاء في هذا الكتاب الموسوم بـ(شرح عوامل ملا محسن). وأسأل الله تبارك وتعالى أن يوفقني إنه خير موفق ومعين. وإلى الله العظيم أرغب أن يجعل ذلك لوجهه الكريم مصروفا وعلى النفع به موقوفا، وأن يكفينا شرّ الحساد، ولا يفضحنا يوم التناد، بمنه وكرمه، إنه الكريم التواب. وفي الختام: أسأل ممن وقف على تفسير العبارات، أن يعفو ويصلح ما وجد فيها نقصا طغي به القلم، أو نشأ من الخطأ والنسيان، لينال بذلك الثواب الجزيل من الملك المنان. وأرجوا من الإخوان الكرام، أن لا ينسوني من الدعاء، وأنا أسأل الله تعالى أن ينفع به كما نفع بأصله، وأن يجعله مقصودا به وجهه الكريم ليكون لي حجة يوم الدين، أمين..

عبدالله ملا أحمد

2000/2/7م. ذي القعدة 1420هـ

أحمد آوا- شهرزور.

## (كورتەی بیۆگرافیای ڕاڤیار)

*ناوی(عبدالله)یە وکوڕی(مەلا شێخ أحمد)ی،(ئەحمەدئاوایی)یە.
*لەساڵی(1982)لەگوندی(ئەحمەدئاوا)ی بناری (هەورامان) لەدایك بووە.
*خوێندنی سەرەتایی وناوەندی ودواناوەندی لە(کوردستانی ئێران) و ( هەڵەبجە) و (خورماڵ) تەواوکردووە.
*بۆساڵی خوێندنی( 2001 -2002) لە(زانکۆی سلێمانی )،(کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان)،(بەشی خوێندنی ئیسلامی) وەرگیراوە.
*لەساڵی(2005)دا ئەوبەشەی بە پلەی(باش)بڕیوە.
*شارەزایی لەهەردووزمانی(عەرەبی)و(فارسی)داهەیەولەهەردووزمانەکەوە کتێبی وەرگێڕاوە.
*لەسەرجەم زانستە شەرعیەکانی( نحو، صرف، فقه، أصول فقه، علوم القران ، علوم الحدیث ،بلاغة ،عقیدة ، منطق ،علم الفرائض ،حدیث ،تفسیر )ی خوێندوە.
*لەخزمەت مامۆستایان ( مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا - باوکی)و(مامۆستا عبدالدائم هەورامانی )و(مامۆستا مظفر-سلێمانی)و (مامۆستادلێرکەلاری- خورماڵ) و ( مامۆستا سەییدکەمالی حوسەینی - جوجەسازی ،مەریوان ) و (مامۆستاحەمەیوسفی ڕەهنمون —مەریوان ) و (مامۆستا مەلا موحەممەدی حافظی باشماخی ،مەریوان ) و ( مامۆستامەلاسەعدی مەحمودی دەمەیەوی ، مەریوان ،کوردستانی ئێران) دەرسی زانستەشەرعیەکانی خوێندوە.
*جگەلەم نوسینەخاوەنی چەندنوسین و وەرگێڕانێکی چاپکراووچاپنەکراوی ترە.
*خاوەنی دەیان گوتار و ڕیپۆرتاژ و نوسینی ڕۆژنامە نوسی یە،کەلەڕۆژنامە وگۆڤارە جیا جیا کانی کوردستاندا بلاّوی کردونەتەوە ،وئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنوسانی کوردستانە.

ئەم کتێبە :

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمدلله والصلاه والسلام علی رسول الله.

لە سەردەمی کزبونی فەقێ وکوژانەوەی چرای حوجرەکانی کوردستان ـ تایبەت سلێمانی ـ زۆرخۆم بەئاسودە دەزانم کەلەبەردەم کتێبێکی مەنهەجیی دێرینی خوێندنی حوجرەدا چۆك دائەدەم، ودەبینم برای بەرێزم کاك مەلا عەبدوڵلا شەرحی بۆ (عەوامیلی مەلاموحسێن) نوسیوە.وقەڵەمەکەی بەکوردی بۆ کورتیی مزگەوتە چۆڵەکان گریاوە،

ئەو حوجرانەی سەدان شاعیروگەورە پیاوی ئەم گەلەی پێگەیاند.ئەم جۆرە کارانە خزمەتێکە بەیاسای فەقێیەتی وهاوارێکە بۆدروستکردنەوەی مەنهەجی پربەرەکەتی حوجرە، بۆیە من دەستخۆشی لی دەکەم،وهیوای بەردەوامی بۆدەخوازم وداوای بەرەکەت وهیدایەتی لەسوێند خۆری قەڵەم بۆدەکەم. لەراستیدائەم پەرتوکە رەچاوی ئاستی سەرەتایی فەقێی تێداکراوەوراڤەکاریش ئەوەی لە پێش چاوگرتوە،وخاڵێکی سەرکەوتوی راڤەکارەو دیسانەوە دەستخۆشی بۆتۆ..

.....

عبدالدائم هەورامانی

17 ربیع الاول 1428

گوندی وێنە.پێنجوێن